## به ناوی گەورە ناوی دڵۆڤان

کتێبخانەی کوردی ئەوین ئامادەی گرتنی هەر چەشنە پێشنیار و گلەیی و یارمەتی لە لایەن لایەنگرانی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی بە تایبەت شاعیران و نووسەرانی خۆشەویست بۆ گەشە پێدانی فەرهەنگ و کوولتوری نەتەوایەتی و بردنەسەرەوەی ئاستی هۆشیاری کۆمەڵایەتی هەیە و سپاسی هەموو ئەو کەسانەی دەکەین کە بە ناردنی پێشنیار و گلەیی لە خزمەت کردن و گەشەپێدانی زووان و فەهەنگی نەتەوایەتی یارمەتیمان ئەدەن و سەری ڕێز و حورمەتیان بۆ دادەنەوێنین ئەمڕۆکە بەختەوەرانە بە هۆی پێشکەوتنی عیلم و زانست ئەو هەلە ڕەخساوە کە بتوانین بە باشترین شێوە ئەرکی بڵاو کردنەوە بە ڕێوە بەرین
بۆیە داواکارین لەو کەسانەی لایەنگری ڕۆشنبیری گەلەکەمانن،هەر بەرهەمێکیان لە بەر دەستایە بۆمانی بەڕێ کەن تا بەڵکو بە یارمەتی خوای گەورە و لایەنگرانی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی بڵاوی بکەینەوە و کتێبخانەی کوردی ئەوینی پێ دەوڵەمەندتر کەین
بۆ پێوەندی و سەردان لە بیرۆکەی(وێبلاگ)کتێبخانەی کوردی ئەوین و هەر وەها ناردنی هەر چەشنە بیر و ڕایەک یا ناردنی پێشنیار و گلەیی دەتوانن بە ناونیشانی ژێرەوە سەردانمان لێ بکەن

**www.evinebook.blogfa.com**

هەر وەها دەتوانن کتێب یا هەر بابەتێکی بە کەڵکێ ترتان هەیە بە ئیمەیلی ژێرەوە بۆمانی بەڕێ کەن هەتاکوو لە سەر تۆڕی ئینتڕنت بڵاوی کەینەوە و هەمووان کەڵکی لێ وەر گرن

**evinebook@gmail.com**

بە سپاسەوە  بەڕێوەبەرانی کتێبخانەی کوردی ئەوین




**خودانێ ئیمتیازێ**
**حافظ قاضی**

**سەرنڤیسەر**
**مؤید طیب**

**مافێن چاپکرنێ د پاراستی نە**

**ئەدرێس**
**کوردستانا عێراقێ – دهۆك**
**ئاڤاهیێ ئێکەتیا سەندیکایێن**
**کرێکارێن کوردستانێ**
**قاتێ سێیەم**
**تەلەفۆن: ٧٢٢٥٣٧٦ – ٧٢٢٢١٢٥**

www.spirez.org
www.spirezpage.net

- **ژمارا وەشانێ:** (١٨٧)
- **نـــاڤێ پـــەرتووکێ:** نیمـا یوشـیج و عەبـدوڵلا گـۆران (نوێکردنەوە و دابڕان)
- **دانان:** ئامر طاهر
- **دەرهێنانا هونەری:** حسین صنعان مەتیخان
- **بەرگ:** بەیار جمیل
- **سەرپەرشتیا چاپێ:** شێروان ئەحمەد تەیب
- **چاپا:** ئێکێ
- **تیراژ:** (٧٥٠) دانە
- **ژمارا سپاردنێ:** (      ) ل سالا ٢٠٠٦
- **چاپخانەیا حەجی هاشم/ هەولێر**

SPIREZ PRESS & PUBLISHER

دار سپیرێز للطباعة والنشر

ئەم کتێبە نـامەیەکی ماستەرە، کە لە زانکۆی سۆربۆنی نـوێ _ پاریســی ٣ (Sorbonne Nouvelle) لــە بەشــی لێکۆڵینــەوە ئێرانییەکانــدا لــە بــرواری ٢٠٠٤/٦/٢٤ پەســەند کــراوە و لــە فەرەنسییەوە وەرگێڕاوەتەوە سەر زمانی کوردی.

## پێشکەشی ئەکەم بە:

- کوردستان، بە هەموو جوانییەکانییەوە
- گیانی پاکی شەهید « طاهر زێوەی »
- داپیرە ئازیزەکەم «حەفسێ» و دایکە خۆشەویستەکەم « ئەسما »
- خوشک و برا دڵسۆزەکانم
- ئەستێرەی گەشی ژیانم
- گیانی «عەبدوڵڵا گۆران» بە بوونەی یادی سەد ساڵەی لە دایکبوونی

# نـــاوەرۆك

# دەروازە

نوێکردنەوەی شیعری  لە ناو جەرگەی ئەدەبیاتی ڕۆژهەڵات و لەوانەش هەر دوو ئەدەبی کوردی و فارسیدا لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا سەری هەڵدا و پەرەی سەند. سەدەیەک پێویست بوو بۆ ئەوەی دەستکەوتە شێوازگەرییەکانی ڕۆمانتیسمی ئەڵمانی، پاشان فەڕەنسی و ئینگلیزی و هەندێ قوتابخانەی تری ئەورووپیی ئازادکردنی شیعر لە کوتوبەندەکانی کلاسیزم، لە هەندێ ئەدەبیاتی ڕۆژهەڵاتدا ڕەنگدانەوەیان هەبێت. پەیدابوونی ڕووداو و گۆڕانکاریی ڕامیاری و کۆمەڵایەتیی بنەرەتی لە ناوچەکەدا، مەرج بوون بۆ ئەوەی هەست بە پێویستیی نوێکردنەوەیەکی کولتووریی هاوشێوە بکرێت. چونکە بزاڤی نوێکردنەوەی شیعری کوردی و فارسی ناکرێ بە لە چاولێکردنێکی ڕەپوڕووت و بێ هۆی ئەدەبی بێگانە بژمێردرێ. پێویست بوو هەست بە لەدایکبوونی سەردەمێکی نوێ بکرێت بۆ ئەوەی زمان و بەرهەمە زمانییەکانیش ببنە جێی ڕەنگدانەوەی گۆڕانەکانی سەردەم. لە سەرەتای سەدەی پێشوودا بوو کە پاش هەندێ گۆڕانکاریی بەرچاوی کۆمەڵگای مەدەنی و ژیانی ڕامیاری، ڕیفۆرمی شیعری لای شاعیرە کورد و فارسەکان بووە جێی بایەخ. ئا لەو کاتەدا و لە ڕێگای ئاشنایەتیی شاعیران لە گەڵ فەرهەنگی ڕۆژئاوایی، هەندێ لە بنەما کولتوورییەکانی ئەورووپی بوون بە بەردی بناغەی نوێکردنەوەی شێوازی شیعری لای ئەم شاعیرانە.

عەبدوڵلا گۆران و نیما یوشیج دوو ناوی ناسراون کە پێیانەوە لەدایکبوونی شیعری نوێ لە مێژووی ئەدەبی کوردی و فارسیدا ڕادەگەیەنرێت. نکۆڵی لەوە ناکرێت کە پێش ئەوان چەند تەقەلایەک لێرەولەوێ بۆ گۆڕینی سیماکانی شیعری کوردی و فارسی دران؛ بەلام دەبێت دانیش بەوە دابنرێت کە ئەمان یەکەم کەس بوون

نوێکردنەوەکەیان بە شێوەیەکی تیۆری داڕشت و تیۆرەکەشیان بە سەر شیعرەکانیاندا پراکتیزە کرد و کاریگەرییەکی بەرچاویشیان لەسەر شاعیرانی دوای خۆیان کرد. سەرەڕای ئەو هەموو تاقیکردنەوانەی لە لایەن شاعیرە فارسەکانەوە لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا کران، سەرکردایەتیی شیعری نوێی فارسی لە سەر ناوی نیما یوشیجەوە تۆمارکرا. هەرچەندە لە سەرەتاوە بەرهەمەکانی تووشی ڕەخنە و سکاڵای هەندێ لە شاعیرانی هاوچەرخی هاتن، بەڵام نیما لە ئاکامدا توانی ژمارەیەکی زۆریان لێ بکاتە لایەنگری ڕوانگە تازەکەی خۆی. ئەمەش بە هۆی هاوسەنگیی بەرهەمە شیعرییەکەی و وتارە تێروتەسەلەکانی کە تیایاندا بە ڕوونی تیۆرە شیعرییەکەی و شێوازی کاری خۆی دەخاتەڕوو و شرۆڤەیان دەکات. دە ساڵ دواتر عەبدوڵلا گۆرانیش دەستی کرد بە بنیاتنانی پلەو پایەیەکی هاوشێوەی نیما یوشیج بۆ خۆی لە ناو مێژووی شیعری کوردیدا. کاریگەریەتی پرۆسە شیعرییەکەی گۆران لە هەردوو ڕووی شێوە و ناوەرۆکەوە ــ هەر چەند بە تیۆرێکی سنووردارتر لە هی نیما ــ وای کرد کە بە باوکی شیعری تازەی کوردی بژمێردرێت.

ئەگەر وەکوو تا ئێستا باوە، لێکۆڵینەوە ئەدەبییەکان هەوڵیان دابێت لە پێوەندی ئەدەبەکان و هۆ و هەڵی کاریگەرییان لە یەکتر لە دەرەوە و ناوەوەی دەقەکاندا بکۆڵنەوە، ئەمجارە دیاردەیەکی پێچەوانە یا خود دابڕانێکی ئەدەبی لە مێژووی ئەدەبی کوردی و فارسیدا پرسیارێکی سەرەکیمان لە لا دەوروژێنێت کە بۆ خوێندنەوەیەکی هاوتەریب و بەراوردی دەقە شیعرییەکانی ئەم دوو شاعیرە گەورەیە پاڵمان پێوە دەنێت. دەمانەوێت لە هۆی دابڕانی دوو ئەدەبی کوردی و فارسی لە قۆناغی نوێکردنەوەدا بکۆڵینەوە و بزانین ئەگەری چی بووە کە شیعری فارسی کە بە شاکارە کلاسیکەکانییەوە، لە قۆناغی کلاسیکی شیعری کوردیدا سەرچاوەی سەرەکی لاسایی

کردنەوە و چاولێکردنی شاعیرە کوردەکان بووە و تەنانەت جێی بایەخ و خۆشەویستیی شاعیرە نوێگەرەکەمان گۆرانیش بووە، لە شیعری تازەدا و بە تایبەتی بە سەرهەڵدانی نیما و شیعری نیمایی، ئەم پایەیە لە دەست دەدات و نوێکردنەوەی شیعری کوردی ڕێڕەوێکی جیاواز لە هی شیعری فارسی دەگرێتە بەر؟ دەکرا هەر وەک شاعیرە کلاسیکەکان، گۆران لاسایی بنەما نوێگەرییەکانی تازەکردنەوەی شیعری فارسی بە ڕابەرایەتیی نیما بکات. کە چی شتێکی وا لە نێوان گۆران و نیمادا نابینرێت. لە کاتێکدا کە بە پێی ئەو بەڵگانەی بە دەسمانەوەن و لە بەشی دووەمی باسەکەماندا دەیانخەینە ڕوو، زۆر ئەستەم دێتە چاو کە گۆران ئاگای لە ناوبانگی شاعیریی نیما نەبووبێت.

بێگومان نوێکردنەوەی شیعری لای گۆران و نیما پێشتر بابەتی چەندین لێکۆڵینەوەو تۆژینەوە بووە کە زیاتر لە چوارچێوەی ئەدەبی نەتەوایەتیی خۆیاندا ئەنجام دراون. جگە لەمەش شیعری نوێی ئەم دوو شاعیرە لە گەڵ هی ناظم‌حکمت و دەیان شاعیری تری کورد و فارس و تورکی سەدەی بیستەم بووەتە بابەتی لێکوڵینەوەی نامەی دکتۆرای کریستین کلاڤیێ کە هەوڵی داوە لە ڕێگای ناوەرۆکی بەرهەمەکانەوە لە ڕۆڵی دەروونناسی و کۆمەڵایەتیی شیعرەکانیان بکۆڵێتەوە و بایەخێکی ئەوتۆی بە لایەنی ڕوخساری شیعرەکان نەداوە[1]. تاکە لێکۆڵینەوەیەک کە تەنیا لەنێوان ئەم دوو شاعیرەدا کرابێت لێکۆڵینەوەی دەرچوونی قوتابی شلێر محمد حاجی یە کە لە سەروای شیعرەکانیان دەکۆڵێتەوە و تۆژینەوەیەکی ئەژمارەیی بۆ جۆری سەروا بەکارهێنراوەکانیان دەکات. لە کۆتاییدا ئەنجامی لێکۆڵینەوەکەی لە چەند خاڵێکدا دادەڕێژێت کە هەندێکیان هەر لە

(1) CLAVLER, C., *Rôle psychologique et social des poésies turque, kurde et persane du XXe siècle*, vol.1, Thèse de doctorat, Sorbonne Nouvelle, 2001, 263p., non publié.

پێش ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەکەش ناسراون و هەندێکیشیان تەنیا بە زمانی ژمارەوە خراونەتە ڕوو و لێکۆڵەر ئەنجامی ئامارەکان بە هیچ شێوەیەک بە تیۆری شیعری هەریەک لەو دووانە نابەستێتەوە و ئەو ڕاستییە فەرامۆش دەکات کە شیعر لە دایکبووی هەردوو لایەنی ڕوخسار و ناوەرۆکە و لێکۆڵینەوەی تەنانەت لایەنێکی ڕوخساری بەرهەمی شاعیر دەبێ بە جۆرێک لە جۆرەکان بە ناوەرۆکی بەرهەم و تیۆرە ئەدەبییەکەیەوە ببەسترێت و ئەنجامەکانی لێ وەربگیرێن. ئەم کەموکوڕییە تەنانەت لە پێشەکیی باسەکەشیدا بە ڕوونی دیارە کە تێیدا هۆی سەرەکیی هەڵبژاردنی توێژینەوەکەی تەنیا بە نەبوونی لێکۆڵینەوەی بەراوردی سەروای شیعری گۆران و نیما لە قەڵەم دەدات. بەبێ ئەوەی سوودی ئەژمارە بەراوردەکەمان بۆ ڕوون بکاتەوە و ئەنجامی لێکۆڵینەوەکەی نابێتە وەڵامی هیچ پرسیارێک کە لە سەرەتای باسەکەیەوە بیوروژاندبێت![1]

شیعری کلاسیکی فارسی وەکوو گوتمان بەدرێژایی سەدەکان سەرچاوەی سەرەکیی بەهرەی شاعیرانی کورد بووە. بۆیە دەکرێ ــ بە تایبەتی لە ڕووی ڕوخساری شیعرییەوە ــ بە میراتگری شیعری کلاسیکی فارسی بژمێردرێت. بەڵام هێندەی نزیکایەتی هەردوو سامانە کلاسیکەکە، نوێکردنەوەکانیان لە یەکترەوە دوورن و دوو ئاراستەی جیاواز دەگرنەوەبەر. ئەگەر باوەڕمان بەوە هەبێت کە هەر نوێکردنەوەیەک جۆرێکە لە دابڕان، بۆ ئەوەی بتوانین بگەینە ئەنجامی لێکۆڵینەوەکەمان ــ کە وەڵامی پرسیارە سەرەکییەکەمان دەبێت ــ پێویستە پێشتر ڕوونی بکەینەوە کە ئەو دابڕانە لە چی بووە؟ دژ بەچ یاسا و نەریتێکی شیعری دابڕانەکە لە هەردوولا هاتۆتە کایەوە؟ ئەم پرسیارەش وەڵام نادرێت مەگەر لە چوارچێوەی تۆژینەوەیەکی زانستی سنووردار نەبێت. ئاشکرایە کە تیۆری سەرەکیی نوێکردنەوەی شیعری گۆران و نیما زیاتر لە ڕووی

---

(١) حاجی، شلێر محمد، *بەراوردی سەروا لە نێوان دوو شاعیری نوێخواز (گۆران و نیما یوشیج) دا*، لێکۆڵینەوەی دەرچوون، ئەدەبی کوردی، زانکۆی سەلاحەددین، ٢٠٠٠، ٧٤ لاپەڕە، دەستنووس.

ڕوخسارەوە واتا لە ئاستی کێش و سەروا و وێنە و زماندا بەرجەستە دەبێت. لە بەر ئەوەش ئێمە بە ڕوخساری شیعرەکانەوە باسەکەمان سنووردار دەکەین بۆ ئەوەی بزانین بە چ کەرەستە و ئامرازێکەوە باڵەخانەی شیعری خۆیان سەر لە نوێ بنیات ناوە.

بۆ خویندنەوەیەکی گونجاو و هەماهەنگی ڕوخساری شیعری گۆران و نیما، بە پێچەوانەی لێکۆڵینەوە بەراوردەکان، هەر بەشێکی باسەکەمان بۆ تاووتۆکردنی بەرهەمی تەنیا یەکێک لەوانە تەرخان کردووە. شیکاریی بەراوردی ئەنجامەکانی هەردوو بەشە سەرەتاییەکەش لە بەشی سێیەمدا دەگونجێنین. ئەم پلانە یارمەتیمان دەدات بو ئەوەی بتوانین سەرەتا شوێنی هەر شاعرێک لە ناو جەرگەی ئەدەبیاتە نەتەوایەتییەکەیدا دەستنیشان بکەین. سوودی ئەم پلانە لەوانەیە زیاتر خۆی لە توێژینەوەی بەرهەمی گۆراندا بنوێنێت کە بە پێچەوانەی زۆربەی ئەو لێکۆڵینەوانەی لە ڕوانگەیەکی ئایدیۆلۆژییەوە تەنیا خەریکی ناوەرۆکی شیعرەکانی بوونە، یانیش کاتێ توخنی ڕوخساریان کەوتوون لایەنی ناوەرۆکیان وەلاناوە، هەوڵ دەدات لێکۆڵینەوەی ڕوخسار و ناوەرۆکی شیعری گۆران لە یەکدی ئاشت بکاتەوە. ئێمە باوەڕمان وایە کە بەرهەمی ئەدەبی لە یەکگرتن و هەماهەنگیی دووسەرەی هەردوو جەمسەری ڕوخسار و ناوەرۆکەوە دێتەدی و هەرچەندە تۆژینەوەکەمان زیاتر بە ڕوخساری شیعرەکانەوە خەریک دەبێت، بەڵام هەر جار هەوڵ دەدەین لەو شوێنەی پێویست دەکات، بە شێوەیەکی زانستی بە لایەنی تێماتیکی و سێمانتیکی شیعرەکان بیبەستین.

# بەشی یەکەم

## پێشەکی: بەرەو نوێکردنەوەی شیعری فارسی

**شیعری کلاسیکی فارسی:** سامانێکی گەورە، هەناسەیەکی لاواز
**شیعری هاوچەرخ:**
- بەرەی کۆنەپەرست
- بەرەی پێشکەوتنخواز

**نیما یوشیج**، ژیانێکی هەژارانە و بەرهەمێکی دەوڵەمەند

## گەڕان بە دوای کێشە هونەرییەکان

تێکدانی ژانرە شیعرییە کلاسیکەکان
کێشی شیعر
- شارەزایی لە بواری کێشی کلاسیکدا
- کێشێکی ئازاد  بۆ شیعرێکی ئازاد
- کێشی تێکەڵاو و کێشی بڕگەیی

**سەروای شیعر**
- کێشەی سەروا
- دەستکاری سەروای کلاسیك
- سەروا، پێناسەیەکی نوێ، ئەرکێکی نوێ

## زمانی شیعریی نیما

**فراوان کردنی کەرەستەکان**

- **پەنابردنە بەر وشەی تەبەری**
- **بەکارهێنانی دەنگی سروشتی**
- **دروستکردنی وشە و زاراوەی تازە**
- **زیندوو کردنەوەی شێوازە کۆنەکانی ڕستەسازیی شیعری**

**وێنەی سەمبۆلیك، باوترین وێنەی شیعری**

# پێشەكی: بەرەو نوێكردنەوەی شیعری فارسی

## شیعری كلاسیكی فارسی: سامانێكی گەورە، هەناسەیەكی لاواز

سەرەتای سەرهەڵدانی شیعری كلاسیكی فارسی بۆ سەدەی دووەمی كۆچی دەگەڕێتەوە و لە ڕووی ڕوخسارەوە پرەنسیپە گشتییەكانی داهێنانی تا سەدەی دوانزدەی كۆچی هەر وەكوو خۆیان دەمێنن. شیعری فارسی بە درێژایی ئەم قۆناغە و بە شێوەیەكی هەرەگشتی لە لایەن ڕەخنەگرانەوە بە سەر سێ سەبكی (style) شیعریی خوراسانی، عێراقی و هیندی دابەش دەكرێت. هەرچەندە ئەم دابەشكردنە ڕەچاوی تایبەتمەندییە هەرێمی، مێژوویی و شێوازییەكان ناكات. شیعری هەریەک لەم ڕێرەوە گشتییانە لە ڕووی ڕوخسار و ناوەرۆكەوە تایبەتمەندیی خۆی هەیە؛ بەڵام هەندێ یاسای نەگۆڕ خۆیان بەسەریاندا دادەسەپێنن. ئەم یاسایانە لە شیعری كلاسیكی فارسیدا بە تایبەتی لە ڕووی كێش، سەروا و زمانی شیعرییەوە جێگیرن. هەر لە سەرەتای پەیدابوونی شیعری كلاسیكی فارسییەوە لە پاش هاتنی ئیسلام بۆ ناوچەكە، كێشەكەی عەرووزی بوو؛ ئەمە بە پێچەوانەی كێشی شیعری سەردەمی پێش هاتنی ئیسلام كە كێشێكی بڕگەیی_هێزی بوو. سەرواش كە سەرەتاكەی بۆ شیعری عەرەبی دەگەڕێتەوە، بە ڕێكخستنی كۆتایی دێڕ یان نیوەدێڕە شیعرییەكان، بە هاوڕێیی ڕەدیف، یان بە تەنیا، بوو بە پێوەرێكی بنەكی داڕشتنی قاڵبە جۆراوجۆرەكانی شیعری وەكوو غەزەل، قەسیدە، قیتعە، موسەممەت، موستەزاد، چوارینە، تەرجیع بەند و تەركیب بەند. لە ڕووی زمانی شیعرییەوە شیعری كلاسیک، وشەی فارسی و عەرەبیی تێكەڵ دەكرد و

لە ڕووی ڕەوانبێژییەوە زانستی ڕەوانبێژیی عەرەبی (**علم البلاغة: بیان، بدیع، معاني**) باشترین سەرچاوەی فێربوون و چاولێکردن بوون بۆ داهێنانی وینە و پێکهاتەی جۆراوجۆری شیعری لە میانەی بابەتە جیاوازەکانی لیریکی، ستایش، سووفی...هتد. هەندێ گۆڕانکاریی مێژوویی، هەر چەند هێواشیش، لە داهێنانی شیعری ئەم قۆناغە مەزنەدا بەرچاو دەکەون؛ وەکوو هاتنە ناوەوەی زۆر وشەی ژیانی ڕۆژانە بۆ ناو شیعری سەبکی هیندی کە پێشتر لە شیعردا بە دەگمەن نەبوایە نەدەبینران. بەڵام ڕادەی ئەم گۆڕانکارییە لاوەکییانە سنووردارە و هەرگیز بەرهەڵستکاری یاسا سەپێنراوەکانی ڕوخساری شیعری ناکەن. تەنانەت لە قۆناغی گەڕانەوەی ئەدەبی (بازگشت ادبی)شدا گۆڕانکارییەکی ئەوتۆ لەم ڕووەوە نابینرێت. لە بەر ئەوەی ئەو بەرهەمانەی لەم قۆناغەدا دێنەدی، لە ڕووی ڕوخسار و تەکنیکی شیعرییەوە لاسایی تەواوی سەبکەکانی خوراسانی و عێراقییان پێوە دیارە[1].

(١) سەبکی خوراسانی بە یەکەم سەبکی شیعری کلاسیکی فارسی دەژمێردرێت. ناوەکە ئاماژە بە ناوچەی خوراسانیش دەکات کە ئەم سەبکە تیایدا لە دایک بووە. بە هۆی سادەیی شیعرەکانی بە سەبکی سادەش ناوی لێ دەبەن. رودکی و فردوسی لە شاعیرە دیارەکانی ئەم قۆناغەن. قاڵبە شیعرییە هەرە دیارەکانی ئەم قۆناغە بریتین لە قیتعە، مەسنەوی، قەسیدە و روباعی. سەبکی عێراقی بە گشتی دەستنیشانی شیعری کلاسیکی فارسیی قۆناغی نێوان سەدەی هەفتەم تا نۆیەمی کۆچی دەکات. غەزەل وەکوو جۆری شیعریی هەرەدیاری ئەم قۆناغە، دەبێتە دەربڕی هزری سووفیی شاعیرانی عێراقی عەجەم (ئێرانی روژئاوای ئەوسەردەمە). شاعیرە هەرە بە ناوبانگەکانی ئەم قۆناغە بریتین لە سعدی، **عطار**، مولوی و **حافظ**. سەبکی هیندی شیعری کلاسیکی فارسی دادەخات و ئاماژە بە گواستنەوەی جوگرافیی داهێنانی شیعریش دەکات کە خۆی لە نێوان سەدەکانی یانزدە و دوانزدەی کۆچیدا دەنوێنێت و قۆناغێکە کە بە زۆری بەرهەمی شاعیرانییەوە لە دەرەوەی ئێران بە تایبەتی لە هیند و ئمپراتۆری عوسمانی دیاریکراوە. هەندێ جاریش بە سەبکی ئیسفەهانی ناوی لێ دەبرێت. بڕوانە: شمیسا، س، *سبکشناسی شعر*، چاپ چهارم، انتشارات فردوس، **١٩٩٩/١٣٧٨**، ص **٢٠-٥٨** و **٢٦٠-٣٠٦**؛ حقوقی، م، *مروری بر تاریخ ادبیات و ادبیات امروز ایران (شعر)*، تهران، نشر **قطره**، **٢٠٠١/١٣٨٠**، ص **٣٧٥-٣٨٠**؛

## شیعری هاوچەرخ

قۆناغی پڕ لە جموجۆڵی کۆتایی سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیستی زایینی کە هاوکات بوو لەگەڵ کۆتایی دەستەڵاتی قاجارەکان لە ئێران و شەڕی یەکەمی جیهانیدا، ماوەی سەرهەڵدانی شیعری هاوچەرخی فارسی بوو. ڕووداوە ڕامیاری و کۆمەڵایەتی و کولتوورییەکانی ئەم ماوەیە و لە سەرووی هەموویان شۆڕشی مەشرووتەخوازیی ئێران ڕۆڵێکی گرنگیان لە لەدایکبوونی سەردەمێکی نوێی ئەدەبیدا هەبوو[1]. فاکتەرە هەرە گرنگەکانی پەیدابوونی ئەم ئەدەبەش ئەوانە بوون کە ئاسۆی ڕامیاری و کلتووریی ڕوشنبیرانی ئێرانیان فراوانتر دەکرد. لەوانە:

**ا-** ڕکەبەریی توند لە نێوان وڵاتە کۆلۆنیالیستەکانی داگیرکەری ئێران بەتایبەتی بەریتانیا و ڕووس و شکست و خۆ بەدەستەوەدانە یەک لەدووای یەکەکانی ئێران کە قوربانیی ئەم ڕکەبەرییە بوو، هەستی ڕەخنەگرانەی خەڵکیی بەرامبەر بە بێهەستیی تەواوی دەستەڵاتدارانی ئێران لە مەر ڕووداوەکان وریا کرد؛

**ب-** هاتوچۆی بەردەوامی ئێرانییەکان بەرەو ئیمپراتۆریی عوسمانی، هیند و وڵاتە ڕۆژئاواییەکان لە لایەک و ناردنەوەی قوتابی بۆ ئەورووپا لە لایەکی ترەوە بووە هۆی ئاشنابوونیان لە گەڵ فەرهەنگی بیانی و بە تایبەتی ڕۆژئاوایی و بەمەش وەرگرتنی وشە و زاراوەی نوێی کۆمەڵایەتی، فەلسەفی و قانوونی لەم زمانە بیانییانە خێراتر کرا؛

**ج-** دامەزراندنی قوتابخانە میسیۆنێرییە ئایینییەکانی ئەمریکی، فەڕەنسی، ئەڵمانی... وەکوو ئالیانسی فەڕەنسی، قوتابخانەی سەن

---

(1) MACHALASKI, F., *La Littérature de l'Iran contemporain*, vol. I, Kraków, Drukania Uniwersytetu, 1965, pp. 7-20.

لووی فەڕەنسی، هتد. هەروەها دامەزراندنی قوتابخانەی تەکنیکیی دارالفنون لە لایەن خودی دەوڵەتی ئێرانەوە و دەستبەکاربوونی مامۆستایانی بیانی لەم قوتابخانانەدا[1].

شیعری ئەم ماوەیە خۆی بە سەر ستوونی ڕۆژنامەکاندا سەپاند و بووە بە ئامرازێکی تایبەتی دەربڕین، لە خزمەت ئاڵوگۆڕە ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتییەکان[2]. بە پێی گۆڕانکارییە ڕوخسارییەکان و ناوەرۆکە ئایدیۆلۆژییەکان شیعری ئەم قۆناغە بە سەر دوو بەرەی کۆنەپەرست و پێشکەوتنخواز دابەش دەکرێت.

## بەرەی کۆنەپەرست

کۆمەڵێ لە شاعیران وەک ادیب الممالک فراهانی و بهار کە ئاشنایەتیی تەواویان لە گەڵ یاسا و نەریتە کلاسیکەکاندا هەبوو پشتگیرییان لە فۆرمە نەگۆڕە کۆنەکانی شیعری دەکرد و بە گونجاندنی ناوەرۆک و بابەتە تازەکان لە ڕوخسارە کلاسیکەکانی وەک قەسیدە، غەزەل و مەسنەویدا، نوێنەرایەتیی شیعری ئەکادیمییان دەکرد.

## بەرەی پێشکەوتنخواز

هەندێ شاعیری تر وەکوو عارف قزوینی و میرزادە عشقی بە پێچەوانەوە، بە تەواوی پێگیرییان بە یاسا ئەکادیمییەکانی کلاسیزم نەدەکرد و وردەوردە زمانی سادە و ساکاری خەڵکی ناو کۆڵان و شەقامەکانیان جێگیری زمانی باڵای شیعری کۆن دەکرد و بە هۆیەوە

---

(١) سەرچاوەی پێشوو؛ آرین پور، ی، *از صبا تا نیما*، جلد دوم، تهران، انتشارات فرانکلن، ١٩٧١/١٣٥٠، ص ٢٢٥-٢٢٦.

(٢) یا حقی، م، *چون سبوی تشنە، ادبیات معاصر فارسی*، چاپ چهارم، تهران، انتشارات جامی، ١٩٩٧/١٣٧٦، ص١٨.

سەرنج و پشتیوانیی خەڵکیان بۆ لای خۆیان ڕادەکێشا. ئەمانە درەگای شیعرەکانیان بەرەو هەندێ وشە و زاراوەی گشتیی زمانی سەرزاری خەڵک کردەوە کە تا ئەو ڕۆژە لە ناو فەرهەنگی شیعردا جێگەیان نەبوو. هەر لە ڕێگای بەرهەمەکانی ئەمانە بوو کە فەرهەنگی شیعری فارسی بە وشە و زاراوەی بیانی دەوڵەمەند بوو. ئەم دەستەیەش وەکوو ئەوانی تر قاڵبە شیعرییە کلاسیکەکانیان بە کاردەهێنا. بەڵام زیاتر ئەو قاڵبانەیان هەڵدەبژارد کە درەنگتر هاتبوونە کایەوە یا خود لە ڕووی یاسا و نەریتی تەکنیکییەوە جۆرە نەرمییەکیان تێدا بە دی دەکرا؛ وەکوو موستەزاد، موخەممەس، دوو بەیتی یان تەسنیف(١).

لە ڕاستیشدا تەنیا لە ڕووی بابەتەوە بوو کە شیعری ئەم ماوەیە توانی خۆی لە گەڵ سەردەمدا بگونجێنێت. بەڵام نە وتاری ڕامیاری، نە بابەتی کۆمەڵایەتیی ڕۆژانە نەیانتوانی ببنە هۆی پەیدابوونی گۆڕانکاریی گشتیی سیما و ڕوخساری شیعری ئەم شاعیرانە. ئەوانەی وەکوو عارف قزوینی و عشقی بە ئیلهام وەرگرتن لە شیعری عوسمانیی ئەوکات هەوڵیان دا هەندێ گۆڕانکاریی بچووک لە شێوازی شیعرەکانیاندا ئەنجام بدەن، دەسپێشخەرییە کە زۆر سنووردارەکانیان، لاوەکی و بێ دەرەنجام مانەوە(٢).

دەزگای *انجمن دانشکده* وەکوو یەکەم دامەزراوی فەرمیی نووسەر وشاعیران لە لایەک و چاپی ڕۆژنامەی *آزادیستان* لە لایەکی ترەوە بوونەتە هۆی گەشەسەندنی ئەو ناکۆکییەی لە نێوان دوو بەرەی کۆنەپەرست و پێشکەوتنخوازدا پەیدا بووبوو. ئەم دەزگا ئەدەبییە کە

---

(١) سەرچاوەی پێشوو، ل ١٩. هەروەها بڕوانە: MORISSON, G., *op. cit.* pp. 178-181

(٢) یا حقی، م، (١٩٩٧/١٣٧٦)، ص ٧٧-٨٠؛ آرین پور،ی، (١٩٧١/١٣٥٠)، ص ٣٤٩-٣٧٧.

له چەند نووسەرێکی گەنجی بلیمەت و بەتوانا پێک هاتبوو ئامانجی ئەوە بوو کە بابەتە تازەکان لە قاڵبە شیعرییە کۆنەکاندا دابڕێژێت. بەم شێوەیە تازەکردنەوەیان بە لایەنی ناوەڕۆکی شیعرەکانیان سنووردار دەکرد و ئەم هەوڵەی خۆیان بە ڕێزگرتن لە شاکارە کلاسیکە کۆنەکانی شیعری فارسی دەزانی. بۆ ئەو ئامانجە و هەر بەو ناوە واتا *دانشکده* ڕۆژنامەیەکیان دەردەکرد کە سەرنووسەری بهار بوو.

تقی رفعت کە لایەنگرێکی بەتینی پێشکەوتنی ئەدەبی و کۆمەڵایەتی بوو، ڕاشکاوانە لە ڕۆژنامەکەیدا *آزادیستان* ڕایگەیاند کە ئەدەبی کلاسیکی فارسی کە لە لایەن کۆنەپەرستانی دانشکدەوە پشتیوانیی لێ دەکرێت، ڕێگا لە پێشکەوتنی ئەدەبی دەگرێت و خۆی و هەڤاڵانی خەبات دەکەن لە پێناو نەهێشتنی ئەو کۆسپە. خۆی کە سێ زمانی تورکی، فارسی و فەرەنسیی بە چاکی دەزانی، بە دەستپێشخەری شیعری نیمایی دەناسرێت. ئەمەش بە نووسینی شیعرێک کە تێیدا شوێنی سەرواکانی لە نێوان نیوەدێڕەکاندا گۆڕی بوو؛ بەڵام قاڵبەکە قاڵبی سونێی (sonnet) شیعری کلاسیکی فەرەنسی بوو. ئەم دیاردەیە لە شیعری جعفر خامنەای دا دووبارە دەبێتەوە. دواتر شمس کسمایی شیعرێک دادەڕێژێت کە تێیدا سیستەمی نیوەدێڕەکان و یەکێتی سەروا تێک دەدات[1]. بەڵام هیچ یەک لەم دەستپێشخەرییە بچووک و دابڕاوانە بۆ گۆڕینی گشتی و هەمەلایەنی ڕوخساری شیعری فارسی سەریان نەگرت.

بەم شێوەیە بۆمان دیاردەبێت چۆن نەریتە کلاسیکەکان وەکوو سیستەمێکی دۆگماتی باڵیان بە سەر داهێنانی شیعریدا هێنابوو. تەنانەت شیعری هاوچەرخیش بە هەر دوو ئاراستەکەیەوە (کۆنە

---

(۱) یا حقی، م، (**۱۹۹۷/۱۳۷٦**)، ص ۸۰-۸٤، آرین پور،ی، (**۱۹۷۱/۱۳۵۰**)، ص ٤۳٦-٤٥۸.

پەرست و هاوچەرخ) نەیتوانی سنووری کێشی عەرووز تێپەڕێنێت و سەرواش جار تەنیا و جاریش بە هاوڕێتی ڕەدیف شێوە کۆنەکەی خۆی پاراست. پابەندبوون بە یاساکانی کێش و سەروا بووبووە جێی ڕەخنەی ئەوانەی کە شیعری ڕۆژئاواییان دەناسی و شیعری کۆنیان بە یەکئاواز (monotonous) هەڵدەسەنگاند. لە بەرانبەر پێویستییە بەلەزەکانی ڕووداوەکانی ڕۆژ، سنووری وشە و زاراوە ئەدەبییەکان کە لە سەردەمی حوکمی سەفەوییەکاندا تا ڕادەیەک فراوان کرا بوو، هەمدیسان تەسک دەهاتە پێش چاو. هەر لە سەدەی نۆزدەهەمی زایینییەوە پێویستیی نوێکردنەوەیەکی شیعری هەستی پێدەکرا، بەلام هەوڵە بچووکەکانی هەندێ لە شاعیران لە پێکردنی ئاگرێکی بەگوڕی گۆڕانکاریی کاریگەر و بەرفراواندا ناکام مانەوە و دەبوایە چاوەڕێی خامەی داهێنەری نیما بکرێت بۆ ئەوەی ئەم هیوایە ببێ بە ڕاستی.

## نیما یوشیج، ژیانێکی هەژارانە و بەرهەمێکی دەوڵەمەند

علی اسفندیاری لە ساڵی ۱۸۹۷ لە گوندی یوش لە هەرێمی مازندران لە دایک بوو. باوکی خاوەن زەوی و زار و مەڕ و ماڵات بوو. منداڵێتی خۆی لە نێوان نەرمیی ژیانی گوندەواری و توند و تیژیی مەلای گوندەکەیان کە فێری خوێندن و نووسینی دەکرد، تێپەڕاند. دوانزدە ساڵی بوو کاتێ خێزانەکەی باری کرد بۆ تاران. پاش کۆتایی هێنانی خوێندنی سەرەتایی لە قوتابخانەی هدایت جاوید، ناوی لە قوتابخانەی فەرەنسیی سەن لووی (Saint Louis) تۆمار کرا. لە خوێندنی خۆیدا زۆر سەرکەوتوو نەبوو؛ بەلام بە پاڵپشتی و چاودێری یەکێک لە مامۆستاکانی خۆی بە ناوی نظام وفا کە یەکێک لە شاعیرە ناودارەکانی ئەوکات بوو، دەستی کرد بە نووسینی شیعر. لە سەرەتادا لاسایی سەبکی کلاسیکی خوراسانی دەکرد و شیعری بە زمانی دایکیشی دەنووسی کە زمانی تەبەری (طبری) بوو.

بەهۆی زانینی زمانی فەڕەنسی دەتوانی تازەترین دەنگ و باسەکانی شەڕی یەکەمی جیهانی لە ڕۆژنامە بیانییەکاندا بخوێنێتەوە. بیرەوەرییەکانی منداڵێتی و حەزە بێ سنوورەکەی بۆ سروشت وای لێ دەکرد کە لە ڕۆژانی پشوودان ڕوو بکاتە گوندەکەیان. هەر لەوێش بوو کە دڵی بە داوی دڵداریی **صفورا** ناوێک گرفتاربوو. بەڵام لە بەر ئەوەی خوشەویستەکەی نەیدەویست ژیانی هێمنی گوند بە ژیانی شار بگۆڕێت، پێوەندییەکەیان لێک پچڕا. بۆ سارێژکردنی برینی دڵدارییە نەکامەکەی، زیاتر لە ناو جیهانی شیعرو شاعیریدا نقۆم بوو و بەردەوام دەچووە چاپخانەی شیعریی شاعر حیدر علی کمالی و لەوێ گوێڕایەڵی شیعری شاعیران ملک الشعرا بهار و علی أصغر حکمت دەبوو.

یەکەم بەرهەمی شیعریی خۆی *قصه رنگ پریده* لە ساڵی **١٩٢٠** دا نووسی و دواتر چاپ کرا. لە ساڵی **١٩٢٣** بوو کە علی اسفندیاری ناوی خۆی گۆڕی و ناوی «نیما»ی لە سەر خۆ دانا و وشەی«یوشیج»[(١)] یشی، کە ئاماژە بەو گوندە دەکات کە لێی لەدایک بووە، وەکوو نازناو خستە پاڵییەوە. هەر لەو ساڵەدا شیعرەکانی لە ناو ستوونی ڕۆژنامەکاندا سەرکەوتنێکی بەرچاویان بەدەست هێنا. لە شیعرەکانی ئەم قۆناغەیدا شاعیر دژی ئەو کۆسپە کۆمەڵایەتییانە وەستا کە لە ژیانی خۆیدا تووشیان هاتبوو. هەرچەندە ئەم شیعرانە ڕەنگدانەوەی بیری کۆمەڵایەتیی نیما بوون، بەڵام لە ڕووی ڕوخسارەوە جیاوازییان لەگەڵ شیعری پێش خویان نەبوو. پاش بەدەست هێنانی شارەزاییەکی تەواو لە بواری یاسا و نەریتە کلاسیکەکانی نووسینی شیعردا و ئاگاداربوون لە هەندێ لەو تەقەڵایانەی لەلایەن شاعیرانی پێش خۆی لەپێناو تازەکردنەوەی شیعریدا درابوون و تەنانەت ئاشنابوون لەگەڵ شیعری نوێی بیانی بەتایبەتی فەڕەنسی، دەستی دایە پرۆسە

---

(١) یوشیج واتە لە دایک بووی یوش.

نوێگەرییەکەی و ئەمەشی بە نووسین و لەچاپدانی کۆمەڵە شیعری *افسانە و ای شب* لە ساڵی **١٩٢٤** دا دەست پێکرد.

بە مەرگی باوکی لە ساڵی **١٩٢٨** بەرپرسیارەتیی بە خێوکردنی خێزان کەوتە ئەستوی. هەر لەو ساڵەدا پەیمانی هاوسەرێتیی لە گەڵ عالیە جهانگیردا بەست. لە ساڵی **١٩٢٣** دا لە دواناوەندی حکیم نظامی لە آستارا بوو بە مامۆستای وانەی ئەدەبی فارسی. لە ساڵی **١٩٣٤** دا گەڕایەوە تاران و لە ساڵی **١٩٤١**ەوە تا ساڵی **١٩٤٣** بوو بە ئەندامی کۆمیتەی نووسەرانی گۆڤاری مجلە موسیقی و هەندێ لە شیعرەکانی تێیدا چاپ کرد. چاپ و بڵاوبوونەی کۆمەڵێ لە شیعرەکانی وەکوو *ققنوس* قۆناغێکی تازەی پرۆسەی نوێکردنەوەی شیعری نیما بوو و ئێستاش لە ئێران بە سەرەتای لە دایکبوونی شیعری نوێ بە هەموو واتای وشە دەژمێردرێت.

لە ساڵی **١٩٤٦** دا نیما لە یەکەمین کۆنگرەی نووسەرانی ئێراندا بەشداریی کرد و تێیدا ژیاننامە و هەندێ لە شیعرە هەڵبژاردەکانی خۆی خوێندەوە. لە ساڵی **١٩٤٩** بەدواوە تا کۆتایی ژیانی لە بەشی چاپەمەنییەکانی وەزارەتی پەروەردەدا کاری کرد. لە ساڵی **١٩٥٢** لە ماڵی خۆی لە تاران بە نەخۆشیی هەناسە بۆ هەمیشە ماڵاوایی لە گەڵ ژیاندا کرد. نیما تا کۆتایی ژیانی هەر بە هەژاری ژیا و شیعرەتازەکانی نەتەنیا پاڵپشتییەکی مادییان بۆ بە دواوە نەبوو، بەڵکوو بوونەتە هۆی ئەوەی ژمارەیەکی بەرچاوی شاعیران و ڕەخنەگرانی ناوداری سەردەمی، دژی تیۆرە تازەکەی بوەستن و بەرپەرچی بیروڕا شیعرییەکانی بدەن[1].

وەکوو گوتمان نوێکردنەوەی شیعری فارسی لای نیما یەکەم دەستپێشخەری نییە لەم بوارەدا. بەڵکوو هەوڵەکەی بەدوای

---

(١) جنتی عطایی، ا، *نیما، زندگی و اشعار او*، تهران، بنگاه مطبوعاتی صفی علی شاه، (**١٩٥٥**)، ص **١-١١**؛ آرین پور، *از صبا تا روزگار ما*، *تاریخ ادب فارسی معاصر*، جلد سوم، چاپ دوم، تهران، انتشارات زوار، **١٣٧٩/٢٠٠٠**، ص**٥٧٩-٦٠٠**؛

LESCOT, R., *Nîma Youchîdj,* Melange Massé, 1963, pp. 1-4.

هەوڵەکانی شاعیرانی پێش خۆی دێت کە سەریان نەگرت. ئەمە لەلایەک و لەلایەکی تریشەوە نوێکردنەوەکە لەڕێگای ئاشنایەتیی نیما لەگەڵ ئەدەبی بیانی و گۆڕانکارییە شیعرییەکانیان بوو. زانینی زمانی فەرەنسی دەرگایەک بوو بۆ ناسینی دوا پێشهات و گۆڕانکارییەکانی شیعری ڕۆمانتیک و سەمبۆلیستی فەرەنسی[1]. زۆربەی ڕەخنەگران وەکوو اخوان ثالث و آل احمد لەو باوەڕەدان کە یەکەم سەرچاوەی کاریگەریی ئەدەبی لەسەر نیما شیعری ئازادی فەرەنسی (french free verse)یە. بەڵام هەموو ڕەخنەگران لە سەر ئەو بابەتە کۆک نین. بۆ نموونە طاهباز کە ئەرکی ڕێکخستن و لێکدانەوە و لە چاپدانی زۆربەی بەرهەمی نیمای گرتبووە ئەستۆ، لە گرنگیی کاریگەریی شیعری فەرەنسی کەم دەکاتەوە و لەو باوەڕەدایە کە تەنیا هەندێ لە شیعرە دواییەکانی نیمان کە لە ڕووی ناوەڕۆکەوە شەقڵی شاعیرانی سەمبۆلیستی فەرەنسی بە تایبەتی مالارمێ (Mallarmé) یان پێوە دیارە[2]. لە کتێبی *ارزش احساسات* ی خۆیدا، نیما ئاماژە بە هەوڵە نوێگەرییەکانی شاعیرانی تورکی عوسمانی وەکوو فکرت، شناسی، نامق کمال، ناجی و رجایی زادە دەکات. بویە نجفی لەوباوەڕەدایە کە کاریگەریی شیعری تورکیی ئەو سەردەمە لە سەر بیروڕای نیما لە هی شیعری فەرەنسی کەمتر نییە[3]. چاوخشاندنێکی خێرا بە سەر لاپەڕەکانی کتێبی *ارزش احساسات* بەسە بو ئەوەی قووڵایەتی وبەرفراوانیی سنووری ئاشنایەتیی ئەم شاعیرە لە شیعری

(۱) اکرمی،م، «نیما بر ملتقای تجدد ادبی ایران و جهان»، در: *یادنامه نیما، مجموعه مقالات کنگره بزرگداشت یکصدمین سالگرد تولد نیما یوشیج*، جلد اول، تهران، مرکز انتشارات کمیسیون ملی یونسکو در ایران، ۱۹۹۹/۱۳۷۸، ص ٤٦.

(۲) طاهباز، س، *زندگی و هنر نیما یوشیج پر درد کوهستان*، تهران، انتشارات زریاب، ۱۹۹٦/۱۳۷۵، ص ١٤٤-١٤٥.

(۳) نجفی، ح، «رابطه وزن و موسیقی در شعر نیما»، در : *یادنامه نیما*، (۱۹۹۹/۱۳۷۸)، ص ٤٣٥-٤٣٦.

هاوچەرخی بێگانەدا و دواپێشهاتەکانی بزانین؛ لەوانە شیعری فەڕەنسی، ئینگلیزی، تورکی، ئەمریکی، بەلژیکی و..هتد[1].

هەرچەندە نیما خۆی هەندێ لە شیعرەکانی لە شێوەی کۆمەڵە شیعری بچووکدا لە چاپ دابوو. بەڵام پاش مەرگی، سەرجەمی شیعرەکانی لە دیوانێکدا کۆکراونەتەوە و لە چاپ دراون. ئەم دیوانە گشت شیعرە فارسییە کۆن و نوێیەکانی نیما، هەروەها شیعرە تەبەرییەکانی ـ کە زیاتر چوارینەن و نیما لە کۆمەڵە شیعرێکدا بە ناوی *روجا* کۆیان کردبووە ـ لە ئامێز دەگرێت. شایانی وتنە کە لە بواری ئەفراندنی هونەریدا نیما نە تەنیا شاعیر، بەڵکوو پەخشاننووسیشە. دوو سەفەرنامە بە پەخشان لە نیما بە جێ ماون کە بیروڕا و بۆچوون و هەست و نەستەکانی نووسەر بەرامبەر بە دیمەنە ڕەنگاوڕەنگەکانی سروشت و ژیان و گوزەرانی دانیشتووانی شارۆچکەی بارفروش (آمل ی ئێستا) دەگرنەوە خۆیان. کۆمەڵێ هەقایەتی هونەریشی لێ بە جێ ماون لەوانە *غول و نقاش*، *کندوهای شکسته*، *مرقد آقا*، هتد.

جگە لە داهێنانی هونەری، نیما لە بواری ڕەخنەی ئەدەبیشدا تواناکانی خۆی دەنوێنێت. کاتێ نیما بوو بە ئەندامی لێژنەی نووسەرانی گۆڤاری *مجله موسیقی*، تێیدا کۆمەڵێ وتاری ئەدەبیی سەبارەت بە بەهای هەست و نەستەکان لە داهێنانی کاری هونەریدا بە شێوەی زنجیرەوتار لە چاپ دا. ئەم وتارانە لەگەڵ هەندێ وتاری تری لە مەڕ شیعر و شانۆگەری، پاش مەرگی نیما لە شێوەی کتێبێک بە ناوی *ارزش احساسات و پنج مقاله در شعر و نمایش* لە چاپ دران. بە مەبەستی ڕوونکردنەوە و لێکدانەوەی تیۆرە شیعرییەکەی، نیما کۆمەڵێ گفتگۆی خەیاڵیی لە شێوەی نامە نووسیوە و تیایاندا هەوڵی

(۱) یوشیج، ن، *ارزش احساسات و پنج مقاله در شعر و نمایش*، Saarbrücken، انتشارات نوید، ۱۹۸۹/۱۳٦۸، ص ۳۷-۷۷.

داوە وەڵامی ئەو پرسیارانە بداتەوە کە لێرە و لەوێ بەرەوڕووی تیۆرە شیعرییە تازەکەی دەبنەوە. گفتگۆکان زیاتر لەگەڵ دراوسێیەکی خەیاڵی دایە کە پرسیارەکانی ئاراستە دەکات. ئەم وتارە ڕەخنەییانە لە کتێبێکدا بە ناوی *دربارە شعر و شاعری* لە چاپ دراون. ژمارەیەکی زۆر لە نامەکانی نیما کە کاتی خۆی بۆ کەس و کار و برادەران و تەنانەت نەیارانی نووسیوە، لە کتێبێکدا کۆ کراونەتەوە و بە ناوی *نامەهای نیما یوشیج* چاپ کراون. بەشێکی زۆری ئەم نامانەش خاوەن ناوەرۆکی ڕەخنەیی تایبەت بە هونەر و شیعرن.

ئێمە هەوڵ دەدەین لەم بەشەدا تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی ڕوخسار و شێوازی شیعری نوێی نیما بخەینە ڕوو. بۆ ئەم مەبەستەش سوود لە نووسراوەکانی خودی نیما لە مەڕ تیۆرە شیعرییەکەیەوە وەردەگرین. هەبوونی تیۆرێکی شیعریی دەوڵەمەند و بە هەمان شێوەش پراکتیزەکردنیان بە سەر شیعرەکانیدا بە شێوەیەکی بەردەوام، باشترین بەڵگەن بۆ ڕەخنەگران کە نیما بە باوکی شیعری نوێی فارسی بژمێرن. نیما دەستی کرد بە بزاڤێکی هەمەلایەنە و گشتگیر کە لە لایەن نەوەکانی پاش خۆی بەردەوام بوو و پەرەشی پێ درا.

# گەڕان بە دوای کێشە هونەرییەکان

## تێکدانی ژانرە شیعرییە کلاسیکەکان

یەکەم ئەزموونی شیعریی نیما بریتییە لە شیعرە کلاسیکەکانی کە زیاتر لە سەبکی خوراسانییەوە نزیکن. لەم قۆناغەدا نیما چێژ لە زۆربەی هەرە زۆری ژانرە شیعرییە کلاسیکەکان وەردەگرێت. وەکوو قەسیدە ( نامە: ل **٥٨٥**؛ سپیدەدم: ل **٥٩٧**)[1] ، غەزەل (چهار غزل: ل **٥٧٥-٥٧٨**)، چوارینە (رباعیات: ل **٥١٩-٥٧٤**)، مەسنەوی (چشمە کوچک: ل **٦٥**؛ گل نازدار: ل ٧١)، قیتعە (نعرە گاو: ل **١٦٤**؛ پدرم: ل **٢٣٥**)، موسەممەت (آواز قفس: ل **١١٩**)، تەرجیع بەند (محبس: ل **٧٣**)، تەرکیب بەند (ای شب: **٣٤**) و چارپارە (شب دوش: ل **٤٠٦**؛ از دور: ل **٤٣١**).

بەو شیوەیە نیما شارەزایی خۆی لەبواری ژانرە ڕەنگاوڕەنگەکانی شیعری کلاسیک و یاسا و نەریتەکانی پێکهێنانیاندا دەسەلمێنێت. بەڵام لە هەندێ لە شیعرەکانیدا کە بە گشتی کلاسیکن، سیستەمی قاڵب و سەروا بە تەواوی لەگەڵ ژانرە کلاسیکەکانی سەرەوەدا ناگونجێن. ئەمە یەکەم جۆری لادانەوەیە لە یاسا کلاسیکەکانی داڕشتنی شیعری. شاعیر بە تێکدانی لاوەکیی سیستەمی ژانرە کلاسیکە ناسراوەکان

---

(**١**) نموونە شیعرییەکانی ئەم بەشە لەم سەرچاوەیە وەرگیراون: یوشیج، ن، *مجموعە کامل اشعار فارسی و طبری*، گردآوری و **تنظیم** سیروس طاهباز، چاپ پنجم، تهران، انتشارات نگاه، **٢٠٠١/١٣٨٠**.

فۆرمی شیعری نەناسراو دێنێتە کایەوە. ئەم دیاردەیە لە نموونەکانی خوارەوەدا بۆمان ڕوون دەبێتەوە:

(**صبح: ل ١٦٦**)

| | |
|---|---|
| چو صبح سر بر کشم | من از ره خوابگاه |
| ز خلوت خود فتد | سوی جهنم نگاه |
| گه به سوی موج و آب | بر سر کوه گاه‌گاه... |

ئەمە یەکێکە لەو دە بەندە شیعرییەی کە هەموو بەندەکانی بە کێشی مونسەریح (موفتەعیلون فاعیلون/ موفتەعیلون فاعیلان)[1] هۆنراونەتەوە. بەڵام بەندەکان لە ڕووی ژمارەی دێڕەوە قەوارەیەکی یەکگرتوویان نییە و هەر بەندێکیش بۆ خۆی سەروایەکی سەربەخۆی هەیە. بۆیە ناکرێ شیعرەکە بە یەکێک لە ژانرە کلاسیکە ناسراوەکان ناوزەد بکەین[2].

(**هنگام که گریه می دهد ساز: ل ٤٥٤**)

هنگام که گریه می دهد ساز
این دود سرشت ابر بر پشت...
هنگام که نیل چشم دریا
از خشم به روی می زند مشت...

زان دیر سفر که رفت از من
غمزه زن و عشوه ساز داده

---

(١) ماهیار، ع، *عروض فارسی، شیوه نو برای آموزش عروض و قافیه*، چاپ پنجم، تهران، نشر قطره، ١٣٧٩/٢٠٠٠، ص ١١٣.

(٢) حسنی، ح، *موسیقی شعر نیما، تحقیقی در اوزان و قالبهای شعری نیما یوشیج*، تهران، انتشارات کتاب زمان، ١٣٧١/١٩٩٢، ص ١٥١.

دارم به بهانه‌های مانوس
تصویری ازو به بر گشاده.
لیکن چه گریستن چه طوفان؟
خاموش شبیست. هر چه تنهاست.
مردی در راه می زند نی
و آواش فسرده بر می آید.
تنهای دگر منم که چشمم
طوفان سرشک می گشاید.

هنگام که گریه می دهد ساز
این دود سرشت ابر بر پشت.
هنگام که نیل چشم دریا
از خشم به روی می زند مشت.[۱]

---

(۱) لەو کاتەدا کە دەست بە گریان دەکات
بە بێ ڕاوەستان ئەم هەورە پڕ دۆکەڵە...
ئەو کاتە کە ئەم دەریا چاوشینە
لە تۆڕەییەوە مست لە ڕوومەتی خۆی ئەدا...

لەو خۆشەویستە سەفەرکردووە کە
بە لەنجە و لار و نازەوە منی بە جێ هێشت
بە هەندێ بەهانەی ناسراو
وێنەیەکی لە بەر کراوم هەیە.

بەڵام چ گریانێک، چ لافاوێک؟
شەوێکی بێ دەنگە. هەمووشتێ تەنیایە.
پیاوێک لە ڕێگادا شمشاڵ دەژەنێت
و دەنگەکەی ماندوو دێتە گوێ.
تەنیای تر منم کە چاوم
لافاوی فرمێسک بەرپادەکاتەوە.
....

کێشی ئەم شیعرە (مەفعوولو مەفاعیلون فەعوولون) سەر بە دەریای هەزەجە و شیعرەکە بە پێی سیستەمی کلاسیک، کێشی یەکرەنگی هەیە (هەموو دێرەکان بەو کێشە هۆنراونەتەوە). سیستەمی سەروای یەکەمین، دووەمین و چوارەمین بەند و ژمارەی نیوەدێرەکان لە هەر بەندێدا، قاڵبی کلاسیکی چارپارەمان دێنێتەوە یاد کە بە نوێترین قاڵبی کلاسیک لە شیعری فارسیدا دەژمێردرێت[1]. بەڵام بەندی سێیەم کە لە شەش دێر پێک دێت و جۆرە نارێکییەک دەخاتە ناو قاڵبی شیعرەکە، رێگامان پێ نادات بە چارپارە بیژمێرین.

(**از ترکش روزگار**: **ل ۱۰۷**)

تا داشت به سر زمانه غوغا
تا کینه بد از رخش هویدا
تا بود هوای انتقامش.

دوا نموونەمان یەکەم بەندە لە پانزە بەندەکانی شیعرێک کە سیستەمی کێش و سەروایان یەکە. کێشەکەیان بریتیە لە (مەفعوولو مەفاعیلون فەعوولون) و سەرواکەشیان ئەم سیستەمە پێرەو دەکات: a a b/ c c d/ e e f/... هەرچەندە یەکێتی کێش و سەروا لەم شیعرەدا بە پێی یاسا کلاسیکەکانی دارشتنی شیعر پێرەو کراوە، بەڵام نە جۆری رێکخستنی سەروا و نە ژمارەی دێرەکان لە هەر بەندێکدا، رێگامان پێ نادەن ناوی یەکێک لە ژانرە شیعرییە کۆنەکانی لێ بنێین[2]. ئەمە تێکدانی فۆرمی شیعرییە لە پێناو بە دی هێنانی قاڵبی شیعری نەناسراو.

شیعری نیما پڕە لەم دیاردانە. ئەمە خۆ دوورخستنەوەیەکی لاوەکییە لە جۆرە کلاسیکە ناسراوەکان و نیشانەی ئەو ئازادییەیە کە

---

(۱) حسنی،ح، (**۱۹۹۲/۱۳۷۱**)، ص ۱۶۷.

(۲) هەمان سەرچاوە، ل ۱۲۷.

شاعیر لە داڕشتنی شیعری کلاسیکدا دەداتە خۆی. بەم جۆرە نیما لە یاسای پێڕەوکردنی ڕەهای نەریتە کلاسیکەکانی داڕشتنی ڕوخساری شیعری سەرپێچی دەکات. هەر شیعرێک لەمانە شوێن تاقیکردنەوەیەکی نوێیە و لە چوارچێوەی ئەزموونێکی سەرەتاییدا و لە ڕووی ڕوخسارەوە جۆرە خۆلادانەوەیەک لە دۆگمە ئەکادیمییە یەکئاوازەکان بەرجەستە دەکات. لەگەڵ ئەوەشدا نیما هەست بەوە دەکات کە بۆ لادانەوە لە کۆسپی یاسا کلاسیکەکان پێویستیی بە دۆزینەوەی چارەسەرێکی بنەڕەتی هەیە.

## کێشی شیعر

### ■ شارەزایی لە بواری کێشی کلاسیکدا

کێش یەکێکە لە لایەنە ڕوخسارییەکانی داڕشتنی شیعری کە جێی بایەخی شاعیرە کلاسیکەکانە. بۆ نیماش هەر وایە و شیعرەکانی خۆی بە کێشی عەرووز دەهۆنێتەوە. داهێنانەکەی لە بواری کێشی شیعریدا یەکێکە لە داهێنانە هەرە بەرچاو و کاریگەرەکان. با جارێ تەماشای شیعرە کلاسیکەکانی بکەین و ئینجا بچینە سەر کێشی شیعری نوێی.

لە پێشەکیی باسەکەماندا ئاماژەمان بەوە کرد کە شاعیرە کلاسیکە فارسەکان هەر لە سەرەتای نووسینی شیعر بە فارسی، کێشی عەرووزی عەرەبییان بە هەندێ جیاوازیی بچووک بە کار دەهێنا. جیاوازییەکانیش بۆ ئەوە بوون کە کێشەکان لەگەڵ تایبەتمەندییەکانی زمانەکەیاندا بگونجێن (لەوانە زۆریی بەکارهێنانی کێشی هەشت هەنگاوی کە لە شیعری عەرەبیدا دەگمەنە). بێ سوود نابێت ئەگەر سەرەتا پێناسەی کێشی شیعر بە لای خانلری یەوە بێنینەوە بیر:

**کێش هارمۆنییه. هارمۆنی تایبەتمەندییەکە کە بە هەست کردن بە یەکێتیی بەشە جیاوازەکان دێتە دی. ئەو هارمۆنییەی خۆی لە شوێندا جێگیر دەکات هەماهەنگییە و ئەوەی خۆی لە کاتدا جێگیر دەکات کێشە**[1].

هەر لە شێوەی شاعیرە کلاسیکەکان، نیما شیعرەکلاسیکەکانی خوی بە کێشەکانی خەفیف، ڕەجەز، ڕەمەل، سەریع، موتەدارک، موتەقارب، موجتەس، موزارع، مونسەرح و هەزەج دادەڕێژێت[2]. بۆ پیشاندانی چۆنیەتی سیستەمی کێشە بەکارهێنراوەکان تەنیا ئاماژە بە دوو نموونە دەکەین.

(**دیهقانا: ل ١٥٩**)

| | |
|---|---|
| دیهقانا! نبری جای بدر از بر ده | از بەیک جای بماندن نشوی آزرده |
| ...تنگتر از قفس شهر ندیدست کسی | چه حدیث آن پسر از تنگ قفس آورده؟ [3] |
| (فاعیلاتون فەعیلاتون فەعیلاتون فەع لون | فاعیلاتون فەعیلاتون فەعیلاتون فەع لون) |

(**قصه رنگ پریده: ل ١٧**)

| | |
|---|---|
| قصەای دارم من از یاران خویش | قصەای از بخت و از دوران خویش |
| یاد می آید مرا از کودکی | همره من بود همواره یکی[4] |
| (فاعیلاتون فاعیلاتون فاعیلون | فاعیلاتون فاعیلاتون فاعیلون) |

لە نموونەی یەکەمدا هەر دێڕەشیعرێک لە هەشت هەنگاو پێک دێت و لە سەر کێشی ڕەمەل هۆنراوەتەوە. دووەم و سێیەم هەنگاوی هەر

---

(١) خانلری، پ، *وزن شعر فارسی*، انتشارات بنیاد فرهنگ ایران، **١٩٩٦/١٣٤٥**، ص**٢٤**.

(٢) حسنی،ح، (١٩٩٢/١٣٧١)، ص ٧٥-١٦٤.

(٣) جۆتیار! بە هیچ شێوەیەک لە گوند دەرمەچۆ — لە مانەوە لە یەک شوێن دا هەرگیز بێزار مەبە
...هیچ کەس قەفەسێکی تەنگتر لە هی شار نەبینیوە — ئەو کوڕە چیەتی باس لە قەفەسی تەنگ دەکات؟

(٤) داستانێکم هەیە لە مەڕ هاوڕێکانم — داستانێکم لە بەختەکەم و لە ڕۆژگارەکەم
لە بیرمە هەر لە منداڵییەوە — کەسێک بەردەوام هاوڕێی من بوو

نیوەدێڕێک گۆڕانیان بەرسەردا هاتووە و بوونەتە مەخبوون و هەنگاوە دواییەکانیش بوونەتە ئەسڵەم. هەموو دێڕەکانی شیعرەکە بەو کێشە هۆنراونەتەوە و کێشی یەکگرتوویان هەیە کە بریتییە لە ڕەمەڵی هەشت هەنگاوی مەخبوونی ئەسڵەم[1]. لە نموونەی دوەمیشدا هەر بەم شێوەیە سیستەمی کێشی یەکگرتووی کلاسیک بۆ هەموو دێڕەشیعرەکان پێڕەو کراوە و کێشەکە بریتییە لە ڕەمەڵی شەش هەنگاوی مەحزووف. ئەم دوو نموونەیە توانا و شارەزایی نیما لە بواری دارشتنی شیعری عەرووزیی کلاسیکدا دەخەنە ڕوو. هەر لەوێشەوە نیما بەرەو تیۆری کێشی شیعری نوێ هەنگاو دەنێت.

## ■ کێشێکی ئازاد بۆ شیعرێکی ئازاد

نیما پێی وایە یەکێک لەو گرفتانەی لە کاتی دارشتنی شیعری کلاسیکدا بەرەوڕووی شاعیر دەبێتەوە بریتییە لە هەماهەنگ کردنی یەکەی سێمانتیکی یا خود واتایی و یەکەی کێشی کە لە سنووری دێڕی شیعریدا دەوەستێت. بۆئەم مەبەستە شاعیر هەندێ جار ناچار دەبێت پەنا بۆ پڕکردنەوە (حشو) ببات بۆ ئەوەی کێشی شیعریی خۆی لە ئاستی دێڕدا تەواو بکات؛ ئەویش بە هەندێ وشە کە بوونیان لە دێڕەکەدا لەوانەیە زۆر خزمەتی واتای شیعرەکە نەکات. نیما بەم شێوەیە باس لەم گرفتە دەکات:

**شاعیرە کۆنەکان (ئەگەر بەرهەمە شیعرییەکانیان لە ڕووی کێش و پێوەندییان بە هەست و نەست و دۆخە جیاوازەکانەوە لێک بدرێن) وەکوو بینیمان، ئازادیی دەربرینیان بە یاسا کۆنەکان (traditional) فرۆشتبوو. زۆرجار پێویستییان بەوە هەبوو وتە شێعرییەکەیان تەواو بکەن لە کاتێکدا کە جارێ سەروا و فۆرمەکان نە هاتۆنەتە دی. بۆیە بە هۆی ناچارییەکی بێ مانا و نا شایستەوە ناچاردەبوون، کاتێ لە ناوەڕاستی نیوەدێڕ یان دێڕەکەن، شێعرەکە تا کوتایی دێڕەکە یا نیوەدێڕەکە پڕبکەنەوە. ئەویش دیارە بە چی[2].**

---

(١) ماهیار، ع، (١٣٧٩/٢٠٠٠)، ص ٥٣.

(٢) یوشیج، ن، (١٣٦٨/١٩٨٩)، ص ٤٤.

لەگەڵ ئەوەشدا داوای بە جێ هێشتنی تەواوی کێش ناکات. بەڵکو بە پێچەوانەوە دەڵێت:

**...شیعری بێ کێش وەکوو پیاوێکی ڕووت وایە. ئێمە دەزانین کە جلۆبەرگ و جوانکاری دەتوانن جوانیی مرۆڤ زیاتر بکەن. بۆیە بە ڕای من کێش یەکێکە لەو ڕەگەزە گرنگ و پێویستانەی پێکهێنەری شیعری ئازادن؛ هەر وەکوو چۆن شیعری کلاسیک پێک دێنن. کێشی شێعری کلاسیک یەکئاواز [یکنواخت – monotonous]ە... من بە درێژایی ئەم چەند ساڵەی دواییدا هەوڵم داوە کێش لە کۆسپەکانی ڕزگار بکەم و شیعر بە پێی دێکلاماسیۆنی سروشتی، واتاکان و بابەتەکە دابڕێژم**[1].

کە واتە بەلای نیما کێش ڕەگەزێکە لە ڕەگەزە بنەماییەکانی شیعری کون و نوێ. بەڵام ئیتر فەرمانبەری لە یاسای یەکێتی کێش بۆ هەموو دێڕەشیعرییەکان ناکات و بەلایەوە پێویستە ئیتر شاعیر واتای شیعر بخاتە سەرووی کێشی شیعرییەوە؛ واتە کێش لە خزمەتی واتادا بێت. بەم شێوەیە یاسای کێشی شیعری نوێی خۆی کە بریتییە لە کێشی ئازاد، دەخاتە ڕوو. نیما لەو باوەڕەدایە کە شیعر وەڵامدەری پێویستییەکی جەماوەرییە و ئیتر کێشی کلاسیک وەکوو خۆی توانای وەڵامدانەوەی ئەم داخوازییانەی نەماوە. ئامانجیشی لێرەدا ئەوەیە کە لە دەستەڵاتی کێشی عەرووزی کلاسیک کەم بکاتەوە و جۆرێکی تازەی کێش دابهێنێت.

**لە بەر پێویستیی جەماوەر و بۆ وروژاندن و بانگهێشت کردنی هەستەکان لە شێوەی ئاڵوگۆڕێکی سروشتی، هەوڵم دا ئەم کێشانە دابهێنم. ئەوەش جۆرێکی شیعرییە کە کێشەکەی لە سەر کێشە عەرووزییەکان بنیات نراوە. دەمەوێت ئیتر کێشە عەرووزییەکان بە سەرماندا زاڵ نەبن. بەڵکو ئێمە بە پێی بارودۆخ و هەستی جۆراوجۆر بە سەریاندا زاڵ ببین**[2].

(۱) جنتی عطایی، ا، (۱۹۵۵)، ص ۱۲.

(۲) هەمان سەرچاوە، ل ۱۵.

دیاره مەبەست وروژاندن و زیندوو کردنەوەی ئامرازێکی ڕیتمی شیعرییە کە بە هۆی کاراکتەرە ئەکادیمییە کۆنەکەی باوی نەماوە. بە پێداگرتن لە سەر پێوەندیی «سروشتی» کە ڕیتمی شیعر و هەست و نەستی دەروونی شاعیر پێکەوە گرێ دەدات، نیما داوادەکات کە ڕیتمی شیعر بە درێژایی شیعرەکە بە پێی ناوەرۆکی (کە خۆی بە گوێرەی هەست و نەستەکانی شاعیر گۆڕانی بەسەردا دێت) ڕێک بخرێت و گۆڕانی بەسەردا بێت. بە ڕای نیما ڕیتمی شیعری کۆن لە ژێر زەبری کێشی یەکئاواز(monotonous)ی عەڕووزیدا بوو؛ کە چی لە شیعری تازەدا ڕیتمی شیعری، فەرمانبەری ناوەرۆکی وتە شیعرییەکان و جۆراوجۆرییان دەبێت. ئەمەش نموونەیەکی شیعری کە بە کێشە تازەکەیەوە هۆنراوەتەوە:

(**شب پره ساحل نزدیک**: **ل ٥١٠_٥١١**)

شب پره ساحل نزدیک با من (روی حرفاش گنگ) می گوید:
(فاعیلاتون فاعیلاتون فاعیلاتون فاعیلاتون فەع)
«چه فراوان روشنایی در اطاق توست!
(فاعیلاتون فاعیلاتون فاعیلاتون فاع)
باز کن در بر من
(فاعیلاتون فەع لون)
خستگی آورده شب در من.»
(فاعیلاتون فاعیلاتون فەع)
به خیالش شب پره ساحل نزدیک
(فاعیلاتون فاعیلاتون فاع)
هەر تنی را می تواند برد هر راهی
(فاعیلاتون فاعیلاتون فاعیلاتون فەع)
راه سوی عافیتگاهی
(فاعیلاتون فاعیلاتون فەع)

وز پس هر روشنی ره بر مفری هست.[1]

(فاعیلاتون فاعیلاتون فاعیلاتون فاع)

........

جیاوازی لە نێوان کێشی ئەم شیعرە و کێشی شیعرە کلاسیکەکانی پێشوو ئاشکرایە. ئەندازەی هەموو نیوەدێڕەکان یەک نییە و بە درێژایی شیعرەکە دەگۆڕدرێت. یاسای کێشی یەکگرتوو کە بنەمای کێشی شیعری کلاسیک بوو شکێنراوە. نیما ئەو ئازادییە دەداتە خۆی کە نیوەدێڕی شیعر لەو شوێنەدا ڕاگرێت کە «وتە شیعرییەکە»ی لێ تەواو دەبێت. ئەمە بەو واتایە نییە کە هەر دێڕێک هەمیشە هەڵگری وتەیەک بێت؛ بەڵکوو زۆرجار وتەیەکی شیعری بە پێی حەز و ئارەزووی شاعیر بە سەر چەند دێڕێکدا دابەش دەکرێت. لەمەودوا ئیتر پێویستیی ناوەرۆکە کە قەوارەی دێڕەکان دەستنیشان دەکات و شاعیر خۆی لە هەموو جۆرە پڕکردنەوەیەکی بێ سوود ڕزگار دەکات. بە لای اخوان **ثالث** ئەمە پاشگەز بوونەوەیە لە چەمکی «حشو»[2] کە پێشتر بە گشتی بە واتای درێژەپێدان و پڕکردنەوەی دێڕ یان نیوەدێڕ دەهات کە لە لایەن کێشەوە دەسەپێنرا[3]. ئەم

---

(١) شەمشەمە کوێرەی دەریا کەناری نزیک بە زمانی بەستە زمانییەوە پێم دەڵێت:

« ژوورەکەت چەند ڕۆشنایی تێدایە!

دەرگام بۆ بکەرەوە

شەو ماندووی کردووم.»

شەمشەوە کوێرەی دەریا کەناری نزیک بە خەیاڵی خۆی

دەتوانێ هەر کەسێ بە هەر ڕێگایەکدا بباتەوە

ڕێگایەک کە بەرەو شوێنێکی حەسانەوە دەڕوات

و وا دەزانێت لەوبەری هەر ڕۆشناییەک ڕێگایەکی قورتاڵ بوون هەیە.

(٢) بۆ باشتر ناسینی چەمکی «حشو» بڕوانە: سبزواری، م، *بدایع الأفکار فی صنایع الأشعار*، تهران، نشر مرکز، **١٣٦٩/١٩٩٠**، ص ١١٦-١١٧.

(٣) أخوان ثالث، م، *بدعتها و بدایع نیما یوشیج*، تهران، انتشارات توکا، **١٣٥٧/١٩٧٨**، ص ٨٨.

پڕکردنەوەیــە بــۆ کۆکردنــەوەی ئــەو هەنگاوانــە بــوو کــە کێشــە عەڕووزییەکە پێیانەوە تەواو دەبوو. بـەڵام زۆرجـار لـە ڕووی واتـاوە ئەوەندە بە سوود نەبوون. لە نموونەی سەرەوەدا هـەنگاوەکانی فـەع، فـاع و فەع لون هەنگاوی کۆتایی نیوەدێڕەکانن. کـە چـی لـە شیعرێکی کلاسیکدا هـەنگاوی کۆتـایی هـەموو نیوەدێـڕەکان یەکسـان بـوو. واتـە دەکرا تەنها یەکێک لەم سێ هەنگاوە ببێتە هـەنگاوی کۆتـایی نیوەدێـڕ و کۆبوونی هەموویان لە یەک شیعردا وەک هـەنگاوی کۆتـایی بـە هـیچ شێوەیەک شیاو نەبوو. نیما لەم بارەیەوە دەڵێت:

**هونەر بریتییە لەوەی بزانی چۆن بۆ کۆمەڵە وشەیەک کێشێکی لێهاتوو تەرخان بکەی بەو شێوەیە کە سەرەڕای یەک بە دوای یەکی نیوەدێڕە کورت و درێژەکان، کاتێ گوێی لێ ڕادەگری، لەزەتت پێ ببەخشێ**(١).

ئەم دیاردەیە خۆی لە نموونەی خوارەوەدا کە بریتییە لە چەند پارچەیەکی یەکێک لە شیعرە تازەکانی، باشتر دەنوێنێت:

(**خانه سریویلی** : **ل ٢٤٤ ــ ٢٥٥**)

**[...]**« سریویلی» آن یگانه شاعر بومی هم،
(فاعیلاتون فاعیلاتون فاعیلاتون فع لون)
کرده خو با زندگی روستایی در وثاق خود،
(فاعیلاتون فاعیلاتون فاعیلاتون فاعیلاتون فع)
زندگی می کرد،
(فاعیلاتون فاع)
شاد و خرم.
(فاعیلاتون)
**[...]** لیک پیش آمد چنان افتاد و آمد این

---

(١) جنتی عطایی، ا، (١٩٥٥)، ص ١٤.

(فاعیلاتون فاعیلاتون فاعیلاتون فاع)

که شبی سنگین

(فاعیلاتون فاع)

آمدش بر پشت در،

(فاعیلاتون فاعیلون)

[...]حرفهای این جهان و زشتی کردارهای آنچه می ارزد

(فاعیلاتون فاعیلاتون فاعیلاتون فاعیلاتون فاعیلاتون فەع)

که به دل مرد نکوکاری از آن لرزد؟

(فاعیلاتون فاعیلاتون فاعیلاتون فەع)

رهنوردی یا به راه خود شود لغزان؟

(فاعیلاتون فاعیلاتون فاعیلاتون فاع)

[...]از چه رو؟...

(فاعیلون)

از چه روی اینسان نفور آوردن؟[1]

(فاعیلاتون فاعیلاتون فەع لون)

........

---

(۱) «سریویلی» ئەوتاکە شاعیرە خۆجێییەش،
که فێری ژیانی گوندەواری بووە لە ماڵی خۆیدا،
بە خۆشی و شادی دەژیا
.... بەڵام ڕووداوەکە وا هاتە پێش
کە لە شەوێکی گراندا
هاتە پشت دەرگاکەیەوە
... قسەکانی ئەم جیهانە و ناشرینیی کردارەکانی چ بەهایێکیان هەیە
کە دڵی پیاوێکی چاک پێیەوە بلەرزێت؟
یا ڕێبوارێک لە ڕێگای خۆیدا بخشێتەوە؟
...بە چ هۆیەکەوە؟...
لە بەر چی ئەوەندە نەفرەت لێ کردن؟

دەبینین کە ژمارەی هەنگاوەکانی نیوەدێڕەکان لە نێوان یەک تا شەش هەنگاو لە گۆڕاندایە و ئەمەش دەکرێ لە چاو ئەو یاسایەی بە ناوی یەکسانیی ژمارەی نیوەدێڕەکان لە ماوەی چەندین سەدەی یەک لەدوای یەکدا بە سەر شیعردا سەپێنرا بوو، بە وەرچەرخانێکی گرنگ لە بواری کێشی شیعری فارسیدا بژمێردرێت. ئیتر هاوقەوارەیی نیوەدێڕەکان نامێنێت و جێی خۆی دەداتە ئازادی و جۆراوجۆریی ئەندازەیان بە هەماهەنگی لەگەڵ ناوەرۆکی شیعر. ئەم گۆڕانکارییەش دەسبەجێ ڕێگای ئەوەمان لێ دەگرێت کە هەمان شێوەی ناولێنان بۆ ئەم کێشانە بە کاربێنین کە بۆکێشە کلاسیکەکان، بە سوود وەرگرتن لە جۆری کێشەکە و جۆر و ژمارەی هەنگاوەکان بە کارمان دەهێنا. تەنیا دەتوانین جۆری ئەو کێشە عەرووزییە دەستنیشان بکەین کە هەنگاوەکانی بۆ داڕشتنی ئەم جۆرە شیعرانە لە لایەن نیماوە بە کارهاتوون. لە نموونەکەماندا هەنگاوەکانی فاعیلاتون، فاعیلون، فەع لون، فەع و فاع سەر بە کێشی ڕەمەڵن[1]. بۆیە بە بۆچوونی نیما بە یەک دێڕ یان نیوەدێڕێک بە تەنیا ناکرێ کێشی شیعرەکە پێک بهێنرێت، بەڵکوو هەموو نیوەدێڕەکان پێکەوە بەشداری لە پێکهێنانی کێشی تازەی شیعرەکەدا دەکەن. لەم ڕووەوە نیما وەڵامی ڕەخنەگران دەداتەوە کە گلەیی داڕشتنی شیعری بێ کێش و سەروای لێ دەکەن:

**بە پێچەوانەوە، من دەمەوێت کێش و سەروا بدەمە شیعری فارسی. شیعری بێ کێش و سەروا شیعری شاعیرە کۆنەکانە... دیارە بە پێچەوانەی ئەمە دێتە بەرچاو، بەڵام بە ڕای من شیعر لە دێڕێک یان نیوەدێڕێکدا ـــ لە ڕووی کێشەوە ـــ ناتەواوە. لەبەر ئەوەی یەک دێڕ یان یەک نیوەدێڕ ناتوانێت بە تەنیا کێشی سروشتیی گوتار پێک بهێنێت. کێش کە دەنگدانەوە و ئاهەنگی وتەیەکی دەسنیشانکراوە ـــ لە نێوان**

(١) ماهیار، ع، (١٣٧٩/٢٠٠٠)، ص ٧٥-١٧١.

**وتەکانی گوتاری شیعریدا – تەنیا لە ڕێگای «هارمۆنی» یەوە دێتە کایەوە؛ بۆیە دەبێت نیوەدێڕەکان و دێڕەکان پێکەوە کێشەکە پێک بهێنن. من دانەری ئەو هارمۆنییەم.... ئەوە زەوقی ئێمەیە هەست بە بنیاتی ئەو کێشە دەکات کە هەر نیوەدێڕێک چەند کورت یا درێژ بێت؛ پاشان چۆن چەند نیوەدێڕێک پێکەوە هاوئاهەنگ بن...هەر نیوەدێڕێک قەرزاری نیوەدێڕەکەی پێش خۆی و یاریدەدەری هی پاش خۆیەتی...**[1]

نیما ئەم یاسایە بە سەر شیعرە نوێیەکانیدا کە بە کێشە عەرووزییەکانی خەفیف، ڕەجەز، موتەدارک، موتەقارب، موزارع و هەزەج کێشراون، جێ بە جێ دەکات.

## ■ کێشی تێکەڵاو و کێشی بڕگەیی

جگە لەوەی باسمان کرد، دوو دیاردەی تر لە ڕووی کێشی شیعرییەوە لە بەرهەمی شیعری نیمادا بەرچاو دەکەون. هەر چەندە ئەم دوو هەوڵە لە چاو هەوڵەکەی پێشوو لاوەکی و پەراوێزی دێنە چاو، بەڵام لەبەر ئەوەی لە دەستنیشانکردنی ڕەهەندە سەرەکییەکانی هونەری شیعری نیمادا یارمەتیمان دەدەن، لێرەدا بە پێویستی دەزانین ئاماژەیان بۆ بکەین. دیاردەی یەکەم بریتییە لە دارشتنی شیعرێک بە دوو کێشی عەرووزی کە بە کێشی تێکەڵاو ناومان لێ ناوە. نیما خۆی لە پەراوێزی شیعرەکە ئاماژە بەم ڕاستییە دەکات و دەڵێت:

**من ئەم شیعرەم بە ئەنقەست بە دوو کێش هۆنیوەتەوە**[2].

(**شب همه شب: ل ٥١٧**)

| | |
|---|---|
| شب همه شب شکسته خواب به چشمم | (فاعیلاتون موفاعیلون فەعیلاتون) |
| گوش بر زنگ کاروانستم | (فاعیلاتون موفاعیلون فەع لون) |
| با صداهای نیم زنده ز دور | (فاعیلاتون موفاعیلون فەع لان) |

(١) یوشیج، ن، *درباره شعر و شاعری*، گردآوری سیروس طاهباز، تهران، انتشارات دفترهای زمانه، (١٣٦٨/١٩٨٩)، ص ٩٨-٩٩.

(٢) یوشیج، ن، (١٣٨٠/٢٠٠١)، ص ٥١٧.

همعنان گشته همزبان هستم. (فاعیلاتون موفاعیلون فەع لون)

جاده اما ز همه کس خالی است (فاعیلاتون فەعیلاتون فەع لان)
ریخته بر سر آوار آوار (فاعیلاتون فەعیلاتون فەع لان)
این منم مانده به زندان شب تیره که باز (فاعیلاتون فەعیلاتون فەعیلاتون فەعیلان)
شب همه شب (فاعیلاتون)
گوش بر زنگ کاروانستم(1). (فاعیلاتون موفاعیلون فەع لون)

وەکوو دیارە شیعرەکە لە دوو بەند پێک هاتووە. بەندی یەکەم بە تەواوی بە کێشی خەفیف و بەندی دووەم بە دوو کێشی خەفیف و ڕەمەل هۆنراوەتەوە(2). کێشەکان لە هەردوو بەندا بە شێوەیەکی ئازاد بە کارهێنراون. ئەم دیاردەیە لای نیما سنووری یەک شیعر تێناپەڕێنێت.

دیاردەی دووەم هۆنینەوەی سێ شیعرە بە کێشی خۆماڵی، بەڵام بۆ منداڵان(3). لەوانە: (بهار: ل **١٥٤**)

بچەها، بهار!
گلها وا شدند.
برفها پا شدند
از رو سبزەها
از روی کوهسار
بچەها، بهار!
......

---

(**١**) هەر شەو و بە درێژی شەوەکە خەو ناکەوێتە چاوم
گوێڕایەڵی دەنگی زەنگڵی کاروانم
لە گەڵ ئەو دەنگە نیوەگیانانە کە لە دوورەوە دەگەنە گوێم،
دەبمە هاودەنگ و هاوزمان
بەڵام ڕێگا لە هەر چی ڕێبوارێک چۆڵە
پەریشانی و وێرانی لە سەر کۆ بوونەتەوە،
تەنیا من لە گەمارۆی ئەو شەوە تاریکەدا
هەر شەو و بە درێژایی شەوەکە
گوێڕایەڵی دەنگی کاروانم.

(**٢**) حسنی،ح، (**١٩٩٢/١٣٧١**)، ص ١٧٢-١٧٥.

(**٣**) نیما لە ژێری ناوونیشانی شیعرەکە، لای چەپی، نووسیوە: **شعر برای کودکان**. واتە شیعر بۆ منداڵان.

دارند می روند
دارند می پرند
زنبور از لونه
بابا از خونه

همه پی کار
بچه ها بهار.[1]

حسنی لەو باوەڕەدایە کە ئەم شیعرەش بە کێشێکی تێکەڵاو هۆنراوەتەوە کە لە سێ کێشی عەرووزیی ڕەمەل، موتەدارک و موتەقارب پێک هاتووە[2]. بەڵام بەلای ئێمە ئەمە بۆچوونێکی چەوتە و دوورە لە ڕاستی. پێمان وایە ئەم شیعرە بە کێشی خۆماڵیی گۆرانییە فارسییەکان کە کێشێکی بڕگەییە، هۆنراوەتەوە. لە بەر ئەوەی شاعیر بە پێچەوانەی شیعری یەکەم بە هیچ شێوەیەک ئاماژە بە بەکارهێنانی کێشی تێکەڵاو لەم شیعرەدا ناکات. حسنی لە شیکردنی کێشی ئەم شیعرەدا ویستوویەتی هەر چۆنێک بێت کێشە عەرووزییەکانی بە سەردا داسەپێنێت و لە شیکردنەوەکەیدا سێ کێشی ڕەمەڵ، موتەدارک و موتەقارب بە شێوەیەکی سەیر تێکەڵێ یەکدی دەبن[3]. ئەم دیاردەیە لای هەرکەسێ کە بیەوێت شیعرێکی هۆنراو بە

(١) منداڵان بەهار!
گوڵەکان گەش بوون
بەفرەکان هەستان
لە سەر سەوزەڵان

لە سەر کوێستان
منداڵان بەهار! .....

خەریکن دەڕۆن
خەریکن دەفرن
مێشە هەنگوێن لە هێلانەوە
بابە لە ماڵەوە

هەموویان بە دوای کار
منداڵان بەهار.

(٢) سەرچاوەی پێشوو، ل **١٧٤** و **١٧٥**.
(٣) هەمان سەرچاوە، هەمان لاپەڕە.

کێشێکی خۆماڵی بە زەبری کێشی عەرووزی شرۆڤە بکات، ناسراوە. لە ڕاستیشدا خوێندنی ئەم شیعرە لە لایەن منداڵەوە بەم کێشە تێکەڵاو و سەیرە کارێکی ئەستەم دێتە بەرچاو. دواتریش وەکوو شاعیر خوی ئاماژەی بۆ دەکات، ئەم شیعرەی بۆ منداڵان هۆنیوەتەوە و لەو سەردەمەدا هۆنینەوەی ئەم جۆرە شیعرانە (شعر عامیانە) بە کێشی بڕگەیی خۆماڵیی فارسی کە لە بنەڕەتدا کێشی گۆرانییە سەرزارەکییەکانە، لای هەندێ لە شاعیرانی هاودەمی نیما باو بوو[1]. شیعرەکانی (آواز قفس: ل۱۱۹)، (کودکان شاد)[2] بە هەمان شێوە بە کێشی بڕگەیی هۆنراون. ئەوەی سەرنجڕاکێشە ئەوەیە کە هیچکام لەو شیعرانە خاوەن قاڵبی تازە نین و لە ڕووی کێش و سەرواوە ناچنە نێو خانەی شیعری نوێی نیما.

(۱) لە بەشی سێیەمی ئەم لێکۆڵینەوەیە بە درێژی لەو بابەتە دەدوێین.

(۲) ئەم شیعرە لە کۆی بەرهەمە شیعرییەکانی نیمادا چاپ نەکراوە و سیروس طاهباز بۆ یەکەم جار لەگەڵ هەندێ شیعری تردا لەم کتێبەیدا چاپیان دەکات: طاهباز، س، *کماندار بزرگ کوهساران، زندگی و شعر نیما یوشیج*، تهران، نشر ثالث، ۲۰۰۱/۱۳۸۰، ل ۱۲۹–۱۳۸.

بۆ چۆنیەتی دەستنیشانکردنی کێشی شیعری بڕگەیی فارسی بڕوانە:

طبیب زادە، أ، *تحلیل وزن شعر عامیانە فارسی*، تهران، انتشارات نیلوفر، ۲۰۰۳/۱۳۸۲.

## سەرەوای شیعر

### ■ کێشەی سەروا

سەروا یەکێکی ترە لە بوارەکانی نوێکردنەوەی شیعری نیما و هەر لە سەرەتاوە وا پێناسە کراوە کە بریتییە لە کۆمەڵێ فۆنێم کە لە کۆتایی نیوەدێڕ یان دێڕی شیعریدا (بە پێی قاڵبی شیعرەکە) جێ دەگرن و لە ڕووی دەنگەوە یەکسان و لە ڕووی واتاوە جیاوازن و دەبێ بە کەمی بزرۆکەیەکیان تێدا بێت و درێژاییەکەشی دەکرێ لە پیتێک تا چەند وشە بێت[1]. ئەم پێناسەیە لەم دێڕە کلاسیکەی نیمادا خۆی بەرجەستە دەکات:

چو ابر بر کرد سر، ز کوه مازندران
سیاه کرد این جهان، همه کران تا کران[2]

**(طوفان: ل ٦٠١)**

لەم دێڕەدا ′ران (-eran) سەروایە کە تا کۆتایی شیعرەکە شوێنی خۆی لە کۆتایی دێڕەکاندا دەپارێزێت. ڕەگەزێکی تر کە هەندێ جار لە شیعری کلاسیکدا هاوڕێتی سەروا دەکات ڕەدیفە و بریتییە لە کومەڵێ فۆنیم یان وشەی سەربەخۆ کە پاش سەروا و بە هەمان دەربڕین دووبارە دەبنەوە و شاعیر بۆ تەواوکردنی گوتاری شیعریی خۆی پێویستی پێیەتی[3]. بۆ نموونە لەم دێڕە کلاسیکەی نیمادا:

سپیدەدم که هوا رنگ گلستان گیرد

---

(١) ماهیار، ع، (١٣٧٩/٢٠٠٠)، ص ٢٧١؛

THIESEN, F., *A Manuel of Classical Persian Prosody,* Wiesbaden, Otto Harrassowitz, 1982, p. 79.

(٢) ئەو کاتەی هەور لە شاخی مازەندەرانەوە سەری دەرهێنا
لەم لا تا ئەو لای جیهانی ڕەش کرد

(٣) ماهیار، ع، (١٣٧٩/٢٠٠٠)، ص ٢٧٣.

دلم به یاد گل روی دوست جان گیرد[^١]- ان سەروا و گیرد ڕەدیفە.

پاش یەکێتی کێش، یەکێتی سەروا بە پێویستییەکی تری شیعری کلاسیک دەژمێردرێت. مەبەستمان لێرەدا لە یەکێتی سەروا، دووبارەبوونەوەیەتی بە شێوەیەکی بەردەوام بە پێی سیستەمی کارکردنی لە ناو قاڵبە جۆراوجۆرەکانی شیعری کلاسیکدا. ئەم سیستەمە لە قاڵبێکەوە بو قاڵبێکی تر بە پێی ئەو یاسا چەسپاوەی پێشتر بۆیان دانراوە، گۆڕانی بە سەردا دێت. بۆ نموونە لە قەسیدە و قیتعەدا یەک سەروا لە کۆتایی هەموو دێڕەکاندا دووبارە دەبێتەوە. کەچی لە مەسنەویدا نیوەدێڕەکانی هەر دێڕێکی شیعری یەک سەروایان هەیە؛ بەڵام مەرج نییە کە لەگەڵ نیوەدێڕەکانی دێڕەکەی پێش یان پاش خۆیاندا هاوسەروا بن[٢]. بە گوێرەی نیما دووبارە بوونەوەی دەنگ یان وشە لە کۆتایی یەکەیەکی شیعری هارمۆنییەکی تر دەبەخشێتە کێشی شیعر. بەڵام شاعیر ڕووبەڕووی گرفتێکی تر دەکاتەوە. پەیڕەوکردنی یەکێتی سەروا لە شیعردا شاعیر ناچار دەکات پەنا بەرێتە بەر ژمارەیەکی سنووورداری وشە. مەبەستمان لەو وشانەیە کە دەتوانن ببن بە سەروا. شاعیر ناچارە وشەی سەروای خۆی لەو دەستەواژەیە هەڵبژێرێت. گرفتەکەش لەوەدایە کە لەوانەیە ئەو وشەیەی مەبەستێتی و لەگەڵ ناوەرۆکی شیعرەکەدا بە تەواوی دەگونجێت، لە دەستەواژەکەدا نەبێت و شاعیر ناچار بێت بو ڕێکخستنی سەروا، پەنا بەرێتە بەر وشەیەک کە هێزی ئەو وشەیەی مەبەستێتی تێیدا نەبێت و ئەو واتا تەواوەی شاعیر بە دوایەتی، تێیدا

---

(٤) بەرەبەیانیان کە هەوا ڕەنگی گوڵستان بە خۆیەوە دەگرێت
دڵم بە یادی گوڵی ڕوومەتی یار دەوروژێتەوە

(١) کامیار، ت، *بررسی منشا وزن شعر فارسی*، مشهد، انتشارات آستان قدس رضوی، ١٣٧٠/١٩٩١، ص ١٥١–١٥٥؛

THIESEN, F., (1982), *op. cit.* pp. 79-81.

کۆ نەبێتەوە. کە واتە داهێنانی شیعری لە ڕووی ڕوخسارەوە لە شیعری کلاسیکدا لە ژێر زەبری سەروای شیعریشدایە. ئەمەش بە گوێرەی نیما کێشەیەک بووە کە شاعیر هەمیشە ناچار بووە لە گەڕان بە دوای وشەکاندا بە جوانترین شێوە چارەسەری بکات. هەرچەندە هەندێ شاعیریش بە ئەنقەست شیعری خۆیان بە سەروای نایاب و دژوارەوە دەست پێ دەکرد بۆ ئەوەی ڕادەی توانای خۆیان لە نووسینی شیعردا پیشان بدەن و لەبەر سەختی کارەکە هەندێ جار بە ناچار تووشی دووبارەبوونەوەی سەروا دەبوون کە لە ڕووی یاسا کلاسیکەکانی دارشتنی سەروا بە کارێکی ناڕەوا (ایطاء) دەژمێردرێت[1].

نیما بە هیچ شێوەیەک دژی بوونی سەروا لە شیعردا نییە. بەڵام تێڕوانینی لەم ڕووەوە لەوەی لە تیۆرەکلاسیکەکاندا هاتووە جیاوازە. بە ڕای نیما «سەروا، دوای کێش ئاوازی دووەمە بۆ وتە...[2]». نیما شیعری بێ سەروا بە مرۆڤێکی بێ ئیسقان دەچووێنێت. بەڵام ئەو سەروایەی داوای دەکات دەبێ لە زەبری دووبارە بوونەوەی بەردەوام ڕزگار بێت. با بزانین نیما چ چارەسەرێک بۆ ئەم کێشەیە دەدۆزێتەوە و چی لە سەروای شیعرەکانی دەکات.

### ■ دەسکاری سەروای کلاسیک

هەر لە ئەزموونە شیعرییە کلاسیکە سەرەتاییەکانیدا نیما یەکڕەنگی و یەک لەدوای یەکی سەروای قاڵبە جۆراوجۆرەکان دەخاتە ژێر دەستکاری بەهرە شاعیرییەکەیەوە. هەندێ جار وایان لێ دەکات کە ئیتر نازانرێت لە گەڵ چ قاڵبێکی کلاسیکدا ڕێز بکرێن:

---

(۱) فلکی، م، *نگاهی به شعر نیما*، تهران، انتشارات مروارید، **۱۳۷۳/۱۹۹٤**، ص ۱٦۱-۱٦٤.

(۲) آرین پور،ی، (**۱۳۷۹/۲۰۰۰**)، ص ٦۲٤.

(گنج است خراب را: ل ٤٠٥)

کردم به هوای میهمانی

آباد، سرای و خانەی تنگ

هر بام و بری شکسته بر جا

چون پای فتاده رفته از هوش

از هر در آن گماشتم باز

بیدار و بهوش پاسبانان

جز نقش تو هر چه شان ز دل دور

جز نام تو هر چەشان فراموش[١]

...........

قاڵبی ئەم شیعرە لە یەکەم تێڕوانینەدا بە هی موسەممەت دەچێت. بەڵام ناتوانرێت بە موسەممەت ناوی لێ بنرێت. ڕاستە کە هەربەندێکی لەچوار نیوەدێڕ پێک دێت و نیوەدێڕە کۆتاییەکانی بەندەکان هاوسەروان؛ بەڵام دەبوایە بە پێی سیستەمی ڕێزکردنی سەروا لە موسەممەتدا، سێ نیوەدێڕی ناوەوەی هەر بەندێک هاو سەروا بن:

a a a b ; c c c b ; d d d b ; ...

بەڵام لەم نموونەیەدا ئەم یاسایە پێڕەو نەکراوە و سەرواکان بەم شێوەیە ڕێزکراون:

ø ø ø b ; ø ø ø b ;....[٢]

---

(١) بە هیوای مێوانداری

ئەم سەرا و خانووە تەسکەم ئاوەدان کرد

هەر بام و بەرێکی لە شوێن خۆیدا شکاو

وەک بڵێی کەسێکی کەوتوو و لە هانا چووە

بە سەر هەر دەرێکیدا جارێکی دیکە

چەند پاسەوانێکی وریا و بەئاگام دانا

کە جگە لە نیگاری تۆ هیچیان لە دڵدا نییە

جگە لە ناوی تو هیچیان لە بیر نییە

(٢) Ø واتە لێرەدا سەروا نییە.

لە نموونەیەکی تردا پێچەوانەی ئەمە دەبینرێت:
(**سال نو**: **ل ١٥٥**)

......
آی طفل فریب خوردەی خام!
ماندە منکوب فکر خویش مدام!
تو یقین داری آنچە نیست چو دام
دام بر راە افتخار تو هست؟
هان در این گیر و دار لیل و نهار
می فریبد زمان تو را، هشدار
کە چە حاصل شدت در آخر کار
ز آنهمە فکرها کە کردی تو.[(١)]
......

ئەم شیعرە وەکوو هی پێشتر لەچەند بەندێکی چواردێڕی پێک دێت و سیستەمی ڕێزکردنی سەرواکانی بەم شێوەیەیە: a a a ø; b b b ø ;...

ئەمجارە بە پێچەوانەی نموونەی پێشوو نیوەدێڕەکانی کۆتایی بەندەکان بێ سەروان و نیوەدێڕەکانی پێشیان لە نێو خۆیاندا هاوسەروان. ئەمە دیسان ڕێگامان پێ نادات قاڵبی ئەم شیعرە بە موسەممەت ناو ببەین. سیستەمی سەروای ژمارەیەکی زۆر لە شیعرە کلاسیکەکانی نیما بەم شێوەیە تێکدراوە و شاعیر لە ڕێزکردنی سەرواکانیاندا تا ڕادەیەک ئازادانە ڕەفتار دەکات. بەڵام هەر بەمە تینوویەتی شاعیر ناشکێت؛ لەبەر ئەوەی ئەم سیستەمە نەناسراوانەش

(١) ئەی منداڵی فێڵ لێکراوی پێنەگەیشتوو!
کە لە دەست هزر و بیرەکانتدا داماویت!
وا باوەر دەکەی ئەوەی کە وەکوو داو نییە
داوێکە لە سەر ڕێگای شانازیت؟
ئا لە گیر و داری ئەم شەو و ڕوژەدا
ڕۆژگار فێڵت لێدەکات، وریا بە
وا چی وە دەستت هێنا لە کۆتاییدا
لەو هەموو هزر و بیرە کە کردت.

خۆیان بە جۆرێک لە جۆرەکان هەمان یاسای دووبارەبوونەوەی سەروا لە شوێنی دیاریکراودا پێڕەو دەکەن. لە شیعری افسانەدا کە شاعیر پێیەوە بۆ یەکەمجار ناوبانگی دەرکرد، هەر بەندێکی چوار دێڕی بە دێڕێکی بێ سەرواوە بە بەندێکی ترەوە گرێ دراوە. لە هەندێ لە بەندەکاندا هەر چوار دێڕ هاوسەروان. لە هەندێ بەندیشدا یەکێتی سەروا لە نێوان دێڕی یەکەم و سێیەم لەلایەک و دێڕی دووەم و چوارەم لەلایەکی ترەوە پێڕەو کراوە. هەندێ جاریش تەنیا دێڕی سێیەمی بەندەکە بێ سەروایە. نیما لەم شیعرەدا بەندی بێ سەرواشی هەیە[1]. بەڵام تەنیا بەمە دڵی خۆش نابێت و بە دوای پێناسە و ئەرکێکی تازە بۆ سەروای شیعری دەگەڕێتەوە.

## ■ سەروا: پێناسەیەکی نوێ، ئەرکێکی نوێ

لێرەدا شاعیر بیر لەوە دەکاتەوە کە سەروا بە شێوەیەکی جیاواز لە هی جاران پێناسە بکات و ڕوڵێکی تازەی پێ ببەخشێت؛ سیستەمێکی تازەی سەرواسازی کە لەگەڵ قاڵبە تازەکانی شیعریدا بگونجێت. با پێشتر نموونەیەک لە قاڵبە تازەکانی ببینین و بزانین دابەشکردنی سەرواکان تێیدا بە چ شێوەیەک بووە:

(**ری را**: **ل ٥٠٥ ـ ٥٠٦**)

« ری را»... صدا می آید امشب ø
از پشت « کاچ» که بند آب a
برق سیاه تابش تصویری از خراب a
در چشم می کشاند. b
گویا کسی است که می خواند... b
اما صدای آدمی این نیست. ø
با نظم هوش ربایی من ø
آوازهای آدمیان را شنیده ام ø
در گردش شبانی سنگین؛ ø
زاندوه های من ø

(١) بڕوانە: یوشیج، ن، (٢٠٠١/١٣٨٠)، ص ٣٨-٦٤.

سنگین تر. c
وآوازهای آدمیان را یکسر c
من دارم از بر. c
یکشب درون قایق دلتنگ ø
خواندند آنچنان؛ ø
که من هنوز هیبت دریا را ø
در خواب ø
می بینم. ø
ری را. ری را... ø
دارد هوا که بخواند. b
درین شب سیا. ø
او نیست با خودش، ø
او رفته با صدایش اما ø
خواندن نمی تواند.[1] b

---

(١) ئەمشەو لە پشت پارچە دارستانی گەمارۆ دراو لە نێوان زەوی و زارەکاندا، دەنگی سەیری "ری را" دێتە گوێم.
ئەم دەنگە لەو شوێنەوە دێ کە گۆم ڕەنگدانەوەی وێنەیەکی ڕەش لە غەم و وێرانی دەکات.
بەڵام ئەم دەنگە دەنگی مرۆڤ نییە.
من دەنگی مرۆڤەکانم
لە کاتی گەڕیانەکانمدا لە شەوانی سەخت و گرانی گرانتر لە غەمەکانی خۆم،
بە وردی بیستووە.
و هەموو ئەو ئاوازانەم لە بیری خۆمدا هەڵگرتووە.
لە شەوێکدا، هەر ئەم مرۆڤانە، لە ناو لۆتکەدا، ئەوەندە بە دڵتەنگی و غەمباری ئاوازیان خوێند
کە من هێشتا ترسی دەریا
لە خەونەکانمدا دەبینم.
ری را. ری را...
حەز دەکا کە ئاواز بخوێنێت.
لەم شەوە تاریکەدا.
لە خۆی بێ ئاگا بۆتەوە،
ئەوەندە لە دەنگی خۆیدا نقوم بۆتەوە
کە توانای ئاواز خوێندنی نییە.

لەم شیعرەدا سەرواکان بە شێوەیەکی هاوسەنگ دابەش نەکراون. هەندێ لە نیوەدێڕەکان بێ سەروان و هەندێکیان بە سەروا بەیەکەوە بەستراون. بەڵام ماوەی نێوانیان گوزارشت لە هیچ سیستەمێکی پێشوەخت دیاریکراو ناکات و یەکێتی و بەردەوامیی سەروا لەم شیعرەدا پێڕەو نەکراوە. دیاربوونی ناو بە ناوی سەروا کە بە تەواوی پێچەوانەی یاسای بەردەوامیی سەروای کۆنە، وامان لێ دەکات لە پێوەری بنیاتنانی بکۆڵینەوە.

پێوەری نیما بۆ دابەشکردنی سەرواکان تەنیا واتای شیعرییە. لە شیعری نیمادا سەروا ئیتر دێڕەکان یا نیوەدێڕەکان لە یەکتر جیا ناکاتەوە و بە نیشانەی کۆتاییان دانانرێت. بەڵکوو وتە شیعرییەکان لە یەکتر جیا دەکاتەوە. هەر سەروایەک نیشانەیە بۆ وتەیەکی شیعری. ئەو کۆمەڵە دێڕانەی یەک واتا هەڵدەگرن بە سەروا بە یەکەوە دەبەسترێن و لە گەڵ گۆڕانی وتەی شیعریدا سەرواش دەگۆڕێت.

**سەروا بە وتەوە بەستراوە[1]. زەنگڵی وتەیە... هەر کە وتە دەگۆڕێت دەبێ سەرواش بگۆڕدرێت. ئەگەر دوو وتە هەمان سەروایان هەبێت، دڵنیام کە وەکوو من بە نا شرینی دەژمێریت[2].**

**سەروا دەبێت وتە و ڕستەکان تەواو بکات. وتەی پێشتر لەگەڵ هی پاشتر مەکەنە هاوسەروا. زۆر ناشرینە. ئەگەر نە ئێوە لە مانا نەگەیشتوون و لە شاعیرە کۆنەکان خرابترن. ...وەکوو ئەو گەنجانەی پێیان وایە کە سەروا بریتیە لە جووت جووت یا تاکەتاک یا ناو بەناو هێنانی[3].**

ئەم دابەشکردنە واتاییەی سەروا، بە حەز و ئارەزووی شاعیرەوە بەستراوە کە چون بە پێی مانای شیعرەکەی و دابەشبوونی وتەکانی، شیعرەکەی خۆی سەروابەندی بکات:

**بە پێی زەوق و پاش کارێکی زۆر خۆتان دەتوانن بزانن کە لە کوێ خوێنەر چاوەڕێی سەروایە. هەر کەسێ شوێنی ئەو چاوەڕوانییە بناسێت سەروای ناسیوە. دەبینن کە سەروا چ کارێکی قورسە و تا چ ڕادە پێویستیی بە زەوق هەیە[4].**

---

(١) مەبەستی نیما لە وتە، وتەی شیعرییە.

(٢) آرین پور،ی، (١٣٧٩/٢٠٠٠)، ص ٦٢٤.

(٣) یوشیج، ن، (١٣٦٨/١٩٨٩)، ص ١٠٦.

(٤) هەمان سەرچاوە، ل ١٠٧.

نیما پێوەندییەکی ڕاستەوخۆ دەخاتە نێوان ناوەرۆک و سەروای شیعر. سەروا هاوکات وەکوو دیارخەرێکی فۆنەتیکی و سێمانتیکی ڕۆڵی ئاماژەیەکی دەنگی بە خۆیەوە دەگرێت و ئیتر گۆڕانی سەروا هاوکات دەبێت لە گەڵ گۆڕانی وتەی شیعری، نەک گۆڕانی دێڕ یا نیوە دێڕی شیعری. هیچ شیعرێکی نیما بە تەواوی بە بێ سەروا نییە. کاتێ نیما باس لە بێ سەروایی دەکات، مەبەستی لەو دێڕانەیە کە سەروا هەڵناگرن. لەم کاتەدا نەبوونی سەروا بە ڕای نیما لە خۆیدا بەشێکە لە سەرواسازی:

....**لە بیر مەکەن کاتێ وتەکان پارچە پارچە و لە ڕستەی کورت کورت دان، شیعرەکانتان دەبێ بێ سەروا بن. هەر ئەم نەبوونە خۆی وەکوو بوونیەتی و لە گوێمدا خۆشییەکی زیاتری هەیە**[1].

لە شیعری کلاسیکدا سەروا وەکوو زەنگڵی کۆتایی دێڕ یا نیوە دێڕ وابوو. بۆیە گوێگر بەوە ڕاهاتبوو کە لەو شوێنە دیارانەدا بەردەوام چاوەڕێی سەروا بکات. بەڵام لە شیعری نیمادا وەکوو خۆی لە سەرەوەدا ئاماژەی بۆ دەکات، سەروا زەنگڵی وتەیە. جا مەرج نییە لەو شوێنانەدا دیار بێت کە پێشتر چاوەڕێ دەکرا. ئەم نادیارییەش کە دەبێتە هۆی سەرسووڕمان، جۆرە چێژێکی ئیستێتیکی بە شیعر دەبەخشێت. ئەم تێڕوانینە نوێیە لە سەروا بە دوای ئەو بیرۆکە نوێیەدا دێت کە گرنگی بە ڕووی سێمانتیکی و پێوەندیدار بە هەستە دەروونییەکانی شاعیر دەدات و ڕوخساری شیعریش لەخزمەتیدا دادەنێت:

(**خانەام ابری ست**: ل ٥٠٤ ـ ٥٠٥)

خانەام ابری ست a
یکسرە روی زمین ابری ست با آن.
از فراز گردنە خرد و خراب و مست a
باد می پیچد.

---

(١) سەرچاوەی پێشوو، ل ١٠٢.

یکسره دنیا خراب از اوست a
و حواس من!
آی نی زن که ترا آواز نی برده‌ست دور از من کجایی؟
خانه‌ام ابری ست اما
ابر بارانش گرفته ست. a
در خیال روزهای روشنم کز دست رفتندم، b
من به روی آفتابم b
می برم در ساحت دریا نظاره.
و همه دنیا خراب و خرد از باد است a
و به ره، نی زن که دایم می نوازد نی، در این دنیای ابر اندود
راه خود را دارد اندر پیش.(١)

له شیعری کلاسیکدا سەروا لە شێوە سادەکەیدا لە بزوێنێک (vowel) و یەک یا چەند نابزوێن (consonant) پێک دێت. لە نموونەی سەرەوەدا دوو وشەی **رفتندم** و **آفتابم** هاوسەروان و سەرواکەیان لە بزوێنی ′ و نابزوێنی م (حرف روی) پێک دێت. هەروەها بە پێی هەمان پرەنسیپ وشەکانی **مست** و **است** هاوسەروان. دیاردەیەکی تری

---

(١) ماڵم هەورییە
هەموو ڕوومەتی زەوی لە گەلیدا هەورییە.
لە سەرووی گردەکەوە ورد و خراپ و سەرخۆش
با دەسوڕێتەوە.
دونیا هەمووی لێوە خراپە
و هەستی من!
ئای شمشاڵ ژەن کە ئاوازی شمشاڵ لە ڕێگا دووری بردووی، لە کوێ؟
ماڵم هەورییە
هەورەکە باران گرتوویەتی.
لە خەیاڵی ڕۆژە گەشاوەکانم کە لە کیسم چوون،
من ڕوو بە ڕۆژم
تەماشای پانتایی دەریا دەکەم
و هەموو جیهان خراپ و وێران و سەرخۆشی بایەکەیە.
و لە سەر ڕێگا، شمشاڵ ژەن کە بەردەوام شمشاڵ دەژەنێت، لەم جیهانە هەورییەدا
ڕێگای خۆی دەگرێتەوە بەر.

سەرواى شیعرى نیما دیاردەى هاودەنگییە. ئەمەش بریتییە لەوەى كە بە پێى نیما مەرج نییە وەكوو لە شیعرى كلاسیكدا ناسراوە، ئەو وشانەى بە سەروا دادەنرێن، لە بزوێن و هەموو پیتە بێ دەنگەكانى دوایدا یەكسان بن. بەڵكوو تەنها جۆرە هاودەنگییەكى سادەش لە نێوانیاندا كە بە پێیەوە خوێنەر هەست بە پێوەندى نێوان ئەو وشانە بكات، دەتوانێت بیانكاتە هاوسەروا:

**سەروا زەنگڵى وتەیە. زۆر قورسە و چى دەبێ، ئەگەر شاعیر لێهاتوو بێت و بتوانێت لە هەر قیتعەیەكى خۆیدا هەندێ سەروا بهێنێتە دى. ئەم سەروایە دەكرێ نە لە «رەوى» وەكوو وشەكەى تر بێت و نە لە «دەخیل» و ئازاد بێت**[1]...

...بۆ ئێمە كە پێویست ناكا سەروا لە رەوى یەكسان بێت، دوو وشە بەكێش و دەنگى جیاوازیشەوە دەتوانن پێكەوە ڕۆڵى سەروا ببینن[2].

هاوشێوەى ئەم دیاردەیە لە شیعرى نوێى فەڕەنسیدا (free vers) بەهاودەنگى (assonance) ناسراوە و بریتییە لە بەسەروا كردنى دوو وشە كە بە پێى یاساى كۆن نابن بە سەروا؛ بەڵام لەبەر ئەوەى لە هەندێ ل بزوێنەكانیاندا لە یەك دەچن، دەتوانن ڕۆڵى سەروا بگێڕن. لەوەدەچێت نیما كە خوێنەرێكى ماندوونەناسى ئەدەبى فەڕەنسى بووە، لە ژێر كاریگەریى ئەم بۆچوونەدا بووبێت. هەرچەندە نیما جیاوازى لە نێوان دەنگە بزوێن و نەبزوێنەكاندا ناكات. ئامانج لە بەكارهێنانى هاودەنگى لە جیاتى سەروا لاى نیما، وەكوو پێشتریش ئاماژەمان پێ كرد، بریتییە لە سووك كردنى كارى شاعیر لە گەڕان بە دواى وشەى شایستە بۆ سەروا[3]. دیارە بە لاى نیماوە وشەكانى **ابریست**، **اوست** و **گرفتەست** كە بە پێى یاسا كلاسیكەكانى سەرواسازى بە هاوسەروا ناژمێردرێن، لەبەر لێكچوونى هەندێ لە دەنگەكانیان دەتوانن هەستى بوونى جۆرە پێوەندییەك لەگەڵ دوو وشەى هاوسەرواى **مست** و **است** دا دروست بكەن.

با بزانین چۆن نیما لەم شیعرەدا دابەشكردنى سەروا لەگەڵ دابەشكردنى واتایى شیعرەكەدا دەگونجێنێت. شاعیر لە شیعرەكەدا

(١) سەرچاوەى پێشوو ل ٨٩.

(٢) هەمان سەرچاوە، ل ١٠٢.

(٣) بڕوانە لاپەڕە ٤٥.

سێ تابلۆی شیعریمان بۆ بەرجەستە دەکات. یەکەمیان وێنەی خانووەکەی و هی زەوی، کە هەورین و بایەکی بە هێز و وێرانکەر لە سوڕانەوەدایە. وێنەکە تابلۆیەکی سروشتیمان دێنێتە بەرچاو. دووەمیان وێنەی خۆیەتی؛ هی هەستەکانی؛ هی خەیاڵ و ڕۆژەگەشەکانی و تەماشاکردنی پانتایی دەریا. وێنەی سێیەمیان هی شمشاڵژەنە. بەشەکانی وێنەی یەکەم کە وتەیەکی شیعری پێک دێنن بە هاودەنگی لە **ست** دا کە جێگری سەروایە، بە یەکەوە بەستراون. ئەو نیوە دێڕانەی وێنەی دووەم پێک دێنن بە سەروای ′م پێکەوە گرێ دراون و ئەوانەی لە پێکهێنانی وێنەی سێیەمدا بەشداری دەکەن بە بێ سەروا هێنراون بۆ ئەوەی لەوانی دی جیا بکرێنەوە. نەبوونی سەروا لە پێکهاتەی وێنەی سێیەمدا، لە وێنەکانی تر جیای دەکاتەوە. وەکوو خودی نیماش ئاماژەی بۆ دەکات، نەبوونی سەروا لێرەدا وەکوو بوونیەتی. چونکە وێنە بێ سەرواکە، بە هۆی بێ سەروابوونیەوە بەرجەستەکراوە.

لە نموونەیەکی تردا دەتوانین هەمان پرەنسیپ واتە پیادەکردنی سەروا بە پێی یەکە واتاییەکان دەستنیشان بکەین:

(**جاده خاموش است: ل ٤٦٦_٤٦٧**)

جاده خاموش است، از هر گوشەی شب هست در جنگل
تیرگی (صبح از پیش تازان)
رخنەای بیهوده می جوید. a
یک نفر پوشیده در کنجی
با رفیقش قصەی پوشیده میگوید. a
بر در شهر آمد آخر کاروان ما ز راه دور _می گوید_
با لقای کاروان ما (چنان کارایش پاکیزەاش هر لحظه می آراست) b
مردمان شهر را فریاد بر می خاست. b

آنکه او این قصەاش در گوش، اما
خاسته افسردەوار از جا

شهر را نام و نشان هر لحظه می جوید a
و به او افسرده می گوید: a
« مثل اینکه سالها بودم در آن شهر نهان مأوا
مثل اینکه یک زمان در کوچه‌ای از کوچه‌های او c
داشتم یاری موافق. شاد بودم با لقای او.» c

جاده خاموش است اما همچنان شب هست در جنگل
تیرگی (صبح از پیش تازان)
رخنه می جوید. a
یک نفر پوشیده بنشسته
با رفیقش قصه‌ی پوشیده می گوید.[1] a

لەم شیعرەدا سەروای ـوید a لە سێ بەندا دووبارە دەبێتەوە؛ لە بەندی کۆتاییدا کە هەمان بەندی یەکەمە و لە بەندی سێیەمیشدا کە لە ڕووی سێمانتیکییەوە لە بەندی یەکەمەوە نزیکە و بابەتی سەرەکی لە

(١) ڕێگا بێ دەنگە، شەو و تاریکی دارستانیان پڕ کردووە.
ڕەشایی (کە سپێدە بە لەزەوە بە دوایدا غار دەدات)
بێ سوود بە دوای شوێن ڕاکردنێکدا دەگەڕێت.
کەسێک، بە شاراوەیی، لە کونجێکدا،
بۆ هەڤاڵەکەی داستانی نهێنییە شاراوەکان دەگێڕێتەوە.
ـ دەڵێت ـ ئاوا کاروانەکەمان لە دوورەوە گەیشتە بەر دەم دەرگای شارەکە
بە بینینی کاروانەکەمان ـ کە هەرساتێ جوانتر و ڕازاوەتر دەبوو ـ،
خەڵکی شار دەیان قیراند...
ئەو هەڤاڵەی ئەم چیرۆکە پڕ ڕەمز و ڕازە دەبیستێت،
بەڵام غەمناک و لە شوێنی خۆی هەستاوە
و بەردەوام لە ناو و نیشانی شارەکە دەپرسێت.
و بە غەمبارییەوە [بە برادەرە داستانگێڕەکەی ] دەڵێت:
«وەکوو ئەوە وایە بە ساڵان لەو شارە پڕ نهێنییەدا ژیابم،
تۆ بڵێی ڕۆژگارێک لە یەکێ لە شەقامەکانی ئەو شارەدا،
دۆست و هاودەمێکم هەبووبێت. لە دیداری لەززەتم بردبێت.»
ڕێگا بێ دەنگە بەڵام شەو هێشتا لە دارستانە.
ڕەشایی کە ....

هەر دووکیاندا بریتییە لە بە دوادا گەڕان و گوتنەوەی شتێک بە کەسێک. بەندەکانی تر کە لە ڕووی سێمانتیکییەوە تا ڕادەیەک سەربەخۆن، سەروای سەربەخۆیان هەیە. دیارە بە پێچەوانەی سیستەمە ڕواڵەتی (superficial) و بەردەوامەکەی (regular) سەروای کلاسیک، سەروای شیعری نیما بە شێوەیەکی ناوبەناو بەڵام بە پێوەندییەکی بەهێز و ورد لە گەڵ واتای شیعرییەوە دێتە ئاراوە. ئەمەش ئەرکی شاعیرە کە ئەم پێوەندییە لە ئاست شیعرەکەدا بە دابەشکردنی سەرواکان بخاتە گەڕ. مادام لەمەودوا سەروا نوێنەرایەتیی یەکە واتاییەکان یا خود وتە شیعرییەکان ( وەکوو نیما دەڵێت) دەکات، نەبوونیشی مانای خۆی هەیە. دەتوانین ئەم سیستەمە بە سیستەمێکی چاوەڕوان نەکراوی سەروا لە قەڵەم بدەین لە بەر ئەوەی شاعیر ـ بە پێچەوانەی سەروابەندیی شیعری کلاسیک ـ پێشوەخت و پێش داڕشتنی شیعرەکەی، جۆری ڕێزکردنی سەرواکانی نازانێت و پاش داڕشتنی شیعرەکەیە کە شێوەی ڕێزکردنیان بە دیار دەکەوێت.

شایانی باسە کە شمیسا لە کتێبەکەیدا *آشنایی با عروض و قافیه* پێی وایە کە سەروا لە لای نیما ئامرازێکە بۆ خۆ دوورەپەرێز ڕاگرتن لە بحر طویل. لە بەر ئەوەی ژمارەی هەنگاوەکان لەم جۆرە کێشەدا بێ سنوورە. بە ڕای شمیسا، نیما بۆ ئەم مەبەستە سەروا لە کۆتایی ئەو دێڕانەدا جێگیر دەکات کە بە هەنگاوێکی عەرووزیی ساغ (وەکوو فاعیلاتون، مەفاعییلون،...) تەواو دەبن؛ بۆ ئەوەی ببێ بە دیارخەری سنووری دێڕی شیعری و شیعرەکە نەبێ بە بحر طویل[1]. مەبەست لێرەدا لەو دەقانەیە کە بە ڕواڵەت وەکو پەخشان دەنووسران، بەڵام بە کێشێکی عەرووزی. بحر طویل واتە کێشی درێژ، ئەو کێشەیە کە ژمارەی هەنگاوەکانی لە هەشت تێدەپەڕێت و نادیارە. سنووری نێوان

---

(١) شمیسا، س، *آشنایی با عروض و قافیه*، چاپ هفدهم، تهران، انتشارات فردوسی، ٢٠٠١/١٣٨٠، ص ٦٦-٦٧.

هەنگاوەکانیش نادیارە. تێکستی شیعری کە بەم کێشە دەنووسرێتەوە شێوازی پەخشان دەگرێتەوە خۆی. واتە هەموو ڕستە شیعرییەکان یەک بەدوای یەک ـوەکوو لە پەخشاندا ـ و بە یەک کێش دەنووسرێنەوە. ئەم جۆرە نووسینە لە شیعری فارسیی سەدەکانی نۆزدە و بیستی زایینیدا باو بوو[١]...وەکوو لە نموونەی خوارەوەدا دیارە:

« صنمی لاله عذاری به روش باد بهاری به نگه آهوی چـینی و به قد سرو خرامان و به رخ چون مه تابان و دهن غنچـه خندان و لبش لعــل بدخشـــان و زنخدان چو نمکدان و.... که از او وام کند مهر و قمر نور و ضیا را....»

فەعیلاتون فەعیلاتون فەعیلاتون فەعیلاتون فەعیلاتون فەعیلاتون فەعیلاتون فەعیلاتون فەعیلاتون فەعیلاتون فەعیلاتون فەعیلاتون فەعیلاتون.......

شیعری نوێی نیما لەو ڕووەوە لەم قاڵبە نزیک دەبێتەوە، کە جاری واهەیە دێڕێکی شیعری ڕستەیەک بە تەواوی ناگرێتەوە خۆی. بەڵکوو چەند دێڕێکی یەک لەدوای یەک ڕستەیەک پێک دێنن. بەم شێوەیە:

فەعیلاتون فەعیلاتون
فەعیلاتون فەعیلاتون فەعیلاتون فەعیلاتون
فەعیلاتون
فەعیلاتون فەعیلاتون فەعیلاتون.
......

دیارە بە یەک لەدوای یەک خوێندنی ئەم دێڕانە وا هەست دەکرێت کە هاوشێوەی بحر طویل ڕیزکراون. نیما خۆیشی ئاماژە بەوە دەکات کە نابێ لە شیعری نوێدا سنووری دێڕەکان نادیار بێت (واتا سنووریان لە نێواندا نەبێت)؛ ئەگینا شیعرەکە دەبێتە بحر طویل[٢]. بۆ دیارکردنی

(١) شفیعی کدکنی، م، *موسیقی شعر*، تهران، مؤسسه انتشارات آگاه، ١٣٧٦، ص ٥٠١-٥١٨.

(٢) یوشیج، ن،(١٩٨٩/١٣٦٨)، ص ٣٤٥-٣٤٧.

سنووری دێڕەکانیش لە شیعری نیمادا، دێڕەکان لەڕووی کێشەوە بە هەنگاوێکی گۆڕاوی (معلول) عەڕووزییەوە ـ وەکوو فەع، فەعلون، فەعلان، مەفاعیلان... کۆتاییان پێ دێت. لەو دێڕانەشدا کە ـ وەکوو لە نموونەی سەرەوەدا ـ بە هەنگاوی سالم کۆتاییان پێ دێت، سەروا بە نیشانەی کۆتایی دێڕ دادەنرێت. واتا سەروا بە تەنیاش دەتوانێت بە خاڵی سنووری دێڕێک لەگەڵ دێڕێکی تردا بژمێردرێت. ئەمە هیچ ڕێگر نییە لەوەی کە دێڕێکی شیعری نوێ بە هەردوو کەرەستەوە، واتە بە هەنگاوی گۆڕاوی عەڕووزی و لە هەمان کاتدا بە سەرواشەوە کۆتایی پێ بێت.

(**مهتاب**: ل ٤٤٤)

می تراود مهتاب    a
(فاعیلاتون فەع لان)
می درخشد شبتاب    a
(فاعیلاتون فەع لان)
نیست یکدم شکند خواب به چشم من و لیک    ø
(فاعیلاتون فەعیلاتون فەعیلاتون فەعیلان)
.....
دستها می سایم    b
(فاعیلاتون فەع لون)
تا دری بگشایم    b
(فاعیلاتون فەع لون)

به پێی گوتەی شمیسا دەبوایە سەروا تەنیا لە کۆتایی ئەو دێڕانەدا دیار بێت کە بە هەنگاوی ساغ کۆتاییان پێ دێت، کەچی لە نموونەی سەرەوەدا دیارە کە سەروا لە کۆتایی ئەو دێڕانەشدا هاتووە کە هەنگاوی کۆتاییان گۆڕاو(فەع لان، فەع لون)ە. کە واتا سەروا تەنیا نیشانەی کۆتایی ئەو دێڕانە نییە کە هەنگاوێکی عەڕووزیی ساغ (سالم) تەواوکەریانە. بەڵکوو ئەمە ڕۆڵێکی لاوەکییە کە سەرەڕای ڕۆڵی سەرەکیی سەروا ـ لە پێکەوە بەستنی وتە شیعرییەکاندا ـ لە لایەن نیماوە بۆی دانراوە.

# زمانی شیعریی نیما

## فراوان کردنی کەرەستەکان

نیما شۆڕشێکی لە گۆڕەپانی کێش و سەروادا کرد، ئەویش بە هێشتنی جێپەنجەی تاکی شاعیر لە سەر کەرەستە گشتی و نەگۆڕەکانی ڕوخساری شیعری. نوێکردنەوەی نیما تا بواری زمانی شیعریش پەرە دەستێنێت. بە لایەوە جێپەنجەی تاکی شاعیر دەبێ لە زمانە شیعرییەکەشیدا دیار بێت. بیر و ڕای نیما لەم بوارەدا لە نووسراوە تیۆرییەکانیدا بە دیاردەکەون کە لێرەدا چەند هێڵێکیان لێ دەخەینە ڕوو:

**هەر کەسێ کە شیعر بنووسێت لە خزمەتی وشەکاندایە، چونکە وشەکان کەرەستەی کارەکەیین. هەر بۆیە کەرەستەکانی لە جۆری بەتین و بەردەوام و شایان هەڵدەبژێرێت. هەر کە وشەیەک واتایەکی گەیاند، تایبەتە بەو واتایە و لە جیهانی وشەکاندا لە نێوان هەردووکیاندا هاوسەرییەک پەیدا دەبێت. شاعر دەبێت ئەمە بزانێت کە لە نێوانیاندا هۆی یەکگرتنەوە هەبێت نەک لەیەک دابڕان....**

**بەڵام کاتی واش هەیە کە خودی شاعیر دەبێت سەرەداوی وشەکان بەدەستەوە بگرێت، درێژەیان پێ بدات، شیکردنەوە و لێکدانەوەی تازەیان بۆ بکات. ئەو شاعیرانەی کەسایەتی فکرییان هەبووە، لە هەڵبژاردنی وشەکانیانیشدا کەسایەتییان هەبووە...**

**زمان بۆ شاعیر هەموو کاتێ ناتەواو، سنووردار و هەژارە. دەوڵەمەندیی زمان، ڕەوانی و کەمالی زمان بە دەست شاعیرە و دەبێ دروستی بکات[1]....**

ڕاستە وشەکان کەرەستەی خاوی داهێنانی شیعرین، بەڵام بۆ نیما هەر زمانێک لە خۆیدا هەژار و لاوازە. شاعیر لە ڕێگای توانای شرۆڤە

---

(١) سەرچاوەی پێشوو، ص ١١٠ و١١١.

و دارشتن و هزری شیعری خۆیەوە زمانی تایبەتی خۆی بەرهەم دێنێت. نیما ئاماژە بە هێزە وەبیرهێنەرەکەی وشەکان دەکات کە لەگەڵ هەست و هزرەکانی شاعیردا لە پێوەندیدان و شاعیر پێویستە بە پێی بەهرەی شیعری خۆی و بەبێ ڕەچاوکردنی سنوورە پێشوەخت سەپێنراوەکانی زمانی شیعری، وشەکانی خۆی هەڵبژێرێت. هەر وشەیەک، بەڕای نیما، جگە لەو واتا گشتییەی (objective sense) بۆی دانراوە، لە توانایدایە واتایەکی تری تایبەت بە خودی شاعیر (subjective sense) بگرێتەوە خۆی کە دەکرێ و تەنانەت دەبێ جیاوازیش بێت لەو واتایەی وشەکە تا ئەو کاتە چ لە ناو زمانی ئستاندارد و چ لە ناو شیعردا بۆی بە کارهاتووە. ئەم واتا تایبەتییانەن کە زمانی ڕاستەقینەی شیعری پێک دێنن. شاعیر بە پێی پێداویستی و ئیلهامی شیعری خۆی واتا بە وشە دەبەخشێت. ئەمە لە لایەکەوە ڕێگە بە وشە دەدات لە زەبری ئەو مانا گشتییەی بۆی دانراوە، یان لە شیعردا بۆی بە کار دەهات، ڕزگاری بێت و ببێتە مایەی دەوڵەمەندیی فەرهەنگی وشەکانی شیعری نیما و لە لایەکی تریشەوە وا دەکات نادیاری و تێکەڵاوییەکی واتایی لە شیعرەکانیدا بێتەکایەوە کە سەرچاوەی تارمایی (ابهام) مانا شیعرییەکەیەتی. جا شاعیر لە چ میکانیزمێک بۆ ئەم مەبەستە سوود وەرگرێت؟

**شاعیرێک کە بیری تازەی هەیە، لێکدانەوەی تازەشی هەیە بۆ وشەکان _ بۆ نموونە بە کار هێنانی ئاوەڵناو لە جیاتی ناو _ لە ڕووی کەرەستەوە دەوڵەمەندترتان دەکات. گەڕان بە دوای وشە لادێییەکان، ناوی شتەکان (دارەکان، گیاکان، گیانلەبەرەکان) هەر یەکەو گەنجێکە لە خۆیدا. لە بە کار هێنانیان مەترسن. وا مەزانن کە یاساکانی چەسپاوی زمان، لە زمانی فەرمی پایتەخت دان. فراوانیی بەکارهێنان ئەم یاسایانەیان هێناوەتە دی... ئەو کاتە بەتواناتر دەبن کە خۆتان بتوانن زاڵ بین و وشەکان بۆ یەکەمجار بۆ چەمکی تایبەتی خۆتان بە کار بهێنن**[1].

(١) سەرچاوەی پێشوو، ص ١٠٩.

نیما داوا لە شاعیر دەکات بە دەستکاری کردنی یاساکانی وشەسازی، بە وەرگرتنی وشەی تایبەتی نوێ لە دەور و بەر، یانیش بە داهێنانی وشەی تازە (neologism) هەڵسێت. ئەمانە تێڕوانینی تیۆری نیما لە ڕوانگەی زمانی شیعرین. با بزانین خۆی بە چ شێوەیەک ئەم میکانیزمە لە شیعرە نوێیەکانیدا بەئەنجام دەگەیەنێت.

- **پەنابردنە بەر وشەی تەبەری**

لایەنێکی تازەی زمانی شیعریی نیما بریتییە لە بەکارهێنانی کۆمەڵە وشەیەکی «نا شیعری» (بە پێی شیعری کلاسیکەوە) کە شاعیر پێوەندییەکی ئۆرگانیکیان لە گەڵدا هەیە؛ واتا بە کارهێنانی ئەو وشانەی لە ژیان و ژینگەی دەوروبەری شاعیردا هەن. بە کار هێنانی ئەم وشانە وادەکات کە بە پێچەوانەی شیعری کۆن، شیعری تازە ڕەنگی ئەو ژینگەیە بگرێتەوە خۆی. ئەمە بە هیچ شێوەیەک بە مانای وەسفی ژینگە و سروشت نییە؛ بەڵکوو بریتییە لە سوود وەرگرتن لە ڕەگەزەکانی ژینگەی ڕاستەقینەی شاعیر بۆ هەر مەبەستێکی شیعری و ئەمە بە پێچەوانەی کەرەستە سنووردارەکانی خەیاڵی شیعری کۆن کە تێیدا بە دەگمەنەوە نەبێت، وشە شیعرییەکان لە سروشتی ڕاستەقینەی ژینگەی شاعیرەوە وەرنەگیراون. تەنانەت ئەگەر شاعیر لە دەشتێکی ڕەپ و ڕووت و وشکیشدا ژیابێت، کە ویستبێتی باس لە خۆشەویست و دڵدار و چاوی یار بکات، هەر گوڵ و بلبل و نێرگزەکەی بە کار هێناوە[1]. زۆربەی جاران دەوروبەر و سروشت و ژینگەی شاعیر وەکوو گەنجینەیەکی دەست لێ نەدراوی پڕ لە وشەو زاراوە لە پەراوێزی فەرامۆشیدا بوون و بە هۆیەوە هەرجار کۆمەڵێکی دیار و سنووورداری وشە جێی خۆی لەناو شیعری شاعیراندا دووبارە خۆش

(١) فلکی، م، (١٩٩٤/١٣٧٣)، ص ٩٠-٩٢.

کردۆتەوە. نیماش بە پێچەوانەوە سوود لەم وشە نەناسراو و دەگمەنانە وەردەگرێت. لەوانە:

**مالا:** نێچیروان

**گوبان:** گاوان

**شکیفتن:** ئارام بوونەوە

**شکوبە:** دەرز

**ساینە:** سێبەر

**ریشتن:** ڕێسین

**پاوزار:** پێڵاو

**زیک:** جۆرێک لە باڵندە

**اسلک:** جۆرێک لە ماسی[1]

......

نیما هەموو ئەم وشانەی لە ژینگەی دەور و بەری خۆیەوە وەرگرتووە. لە بیر نەکەین کە نیما بە درێژایی ساڵ زۆر جار دەگەڕایەوە یوش و سروشتی گوندەکەیان شوێنێکی ڕاستەقینەی حەوانەوەی بوو. ژمارەی ئەم وشانە لە شیعری نیمادا لە نۆسەد دانە زیاترە[2]. زمانی دایکی نیما تەبەری یە کە زمانی دانیشتووانی دەڤەری پڕ لە سەوزایی و جوانی مازەندەرانی کەنار دەریای قەزوینە. ئەم زمانە بۆ نیما باشترین سەرچاوەی وشەی تازە و بەکارنەهێنراوە. وەکوو گوتمان بەکارهێنانی ئەم وشانە نە تەنیا ڕواڵەتێکی سروشتیی ڕاستەقینە دەداتە شیعری نیما، بەڵکو زۆر جار دەبێتە ئاستەنگ لە بەردەم تێگەیشتنی ناوەرۆکی شیعری نیما. لەبەر ئەوەی زمانی تەبەری زمانی ناوچەیەکی بچووکی ئێرانە و خوێنەرانی شیعری نیما کە زۆربەیان فارسی زمانن لە واتای ئەم وشانە تێناگەن و پێویستییان

---

(١) یوشیج، ن، (٢٠٠١/١٣٨٠)، ص ٦٠٤-٦٠٩.

(٢) نصیری سوادکوهی، ف، «واژەهای مازندرانی در اشعار نیما یوشیج» در: *یادنامە نیما*، (١٩٩٩/١٣٧٨)، ص ٢٧٣-٣٠٦.

بە فەرهەنگی تایبەت بەو وشانەوە هەیە. ئەمە سەرچاوەی یەکێک لەو ڕەخنانە بوو کە نیما لە کارە تازەکانیدا بەرەو ڕووی دەبووەوە؛ لەوەی کە زۆرجار واتای وشە شیعرییەکانی نادیارە یان وشەکان وشەی شیعری نین... تەنانەت زۆربەی ئەم وشانە لە لایەن خودی تەبەری زمانانەوە بە دەگمەن بە کار دێن و وشە و زاراوەی کۆنن. نیما لە وەڵامی ئەوەدا کە شاعیرانی هاوچەرخی، زمانی شیعریی خۆیان بە وشەی بیانی (بە تایبەتی فەرەنسی) تێکەڵ دەکەن[1] دەڵێت:

**وەکوو هەموو خەڵک منیش قسەی خۆم دەڵێمەوە. ئەگەر ئەوان زمانی خۆیان تێکەڵ کردووە منیش تێکەڵی دەکەم، بەڵام بەتەمام بەو وشانە تیکەڵ ببێت کە هۆزەکەم وا خەریکە لە بیری دەکات**[2]...

دیارە جگە لەو مەبەستانەی باسمان کرد، ئامانجێکی تری بەکارهێنانی وشە دەگمەنەکان پاراستنیانە لە توانەوە و بزربوون. نابێت کە وەرگرتنی وشە و زاراوەی سروشت و ژینگەی شاعیر بە واتای بە کار هێنانی زمانی ناو شەقام و بازاڕ (زمانی ژیانی ڕۆژانەی خەڵکی) بزانین. چونکە نیما دژی بەکارهێنانی ئەم جورە زمانەیە لە شیعردا. بە ڕای ئەو زمانی ناو شەقام و بازار لە ئاست تێگەیشتنی خەڵکی ئاساییە و بەکارهێنانی زمانی ئەم توێژە ئاستی شیعر نزم دەکاتەوە[3]. بەڵام ئەمانە تەنیا کەرەستەی نوێکردنەوەی فەرهەنگی شیعری نیما نین...

## • بە کارهێنانی دەنگی سروشتی

ئەو پێوەندییەی نیما لە گەڕان بەدوای کەرەستەی تازەی زماندا لەگەڵ ژینگەی دەوروبەریدا دروست دەکات بە وەرگرتنی دەنگە سروشتییەکانی ناو ئەو ژینگەیە پتەوتر دەبێتەوە. بێگومان بە کار هێنانی دەنگی سروشتی (onomatopoeia) لە شیعری نیمادا بۆ

---

(١) لە بەشی سێیەمی کتێبەکەمان باس لەم بابەتە دەکەین.
(٢) یوشیج، ن، (١٣٧٥/١٩٩٦)، ص ٦١٣.
(٣) فلکی، م، (١٣٧٣/١٩٩٤)، ص ٩٧.

یەکەمجار نییە کە لە شیعری فارسیدا بەرجەستە دەبێت. بۆ نموونە مولانا جلال الدین رومی ناودار بە مولوی شاعیری سووفی بە ناوبانگی فارسیش لە شیعرەکانیدا دەنگی بە کار هێناوە. بەڵام جیاوازییەکەی لەگەڵ هی نیما لەوەدایە کە لای نیما ئەم دەنگانە وەکوو کەرەستەی دەربڕین لە میانەی گەڕانی بەدوای کەرەستەی تازەی شیعری لە دوروبەریدا و دروستکردنی پێوەندییەکی نوێ لەنێوان شاعیر و دەوروبەردا هاتۆنەتە کایەوە. کە چی لای مولانا ئەم دەنگانە پێوەندییان بە هەندێ بارودۆخی دەروونی تایبەت بە شاعیری سووفییەوە هەیە[1]

**گمب گمب** آن سنگها می‌غلطند (**خانه سریویلی**، ل: ٢٦٠)

بادها از دور: **هو هو** (**هەمان**، ل: ٢٧١)

**دینگ دانگ**..... چه صداست (**ناقوس**، ل: ٣٣٩)

**چوک و چوک**!...گم کرده راهش در شب تاریک

(**شب پره ساحل نزدیک**، ل: ٥١٠)

......

- **دروستکردنی وشە و زاراوەی تازە**

نیما هەر بەوە ناوەستێت کە وشە و زاراوەی ئامادە لە دەوروبەری خۆیەوە وەربگرێت و بخاتە ناو جەرگەی شیعری. بینیمان چۆن داوا لە شاعیر دەکات ورەی هەبێت و خۆی وشەی تازە دابهێنێت. نیماخۆی بۆ ئەم مەبەستە لە یاساکانی مۆرفۆلۆژیی زمانی فارسی سوود وەردەگرێت. شاعیر بەم شێوەیە هەندێ جار جۆرە نادیارییەکی سێمانتیکی بە شیعرەکەی دەبەخشێت و خوێنەریش خۆی لە تارماییەکی واتاییدا دەبینێت و پێویستیی بە خوێندنەوەیەکی قووڵتر و وردتری شیعرەکە دەبێت. بەڕای نیما ئەوەی قووڵە، نادیارە و ئەم نادیارییە جوانیی بەرهەمەکە زیاتر دەکات. لە بەر ئەوەی بوار بە

(١) سەرچاوەی پێشوو، ص ٩٤.

ڕاڤەکردنی جۆراوجۆری دەق دەدات. ئەم جۆرە تێڕوانینە لە جوانکاریی (aesthetics) دەق، بۆ دروستکردنی وشە و تەرکیبی نوێ پاڵی پێوە دەنێت. بۆ نموونە لە دێڕی خوارەوەدا:

هر تنی زانان، جدا از خانمانش، بر سکوی در، نشسته تر (**مرغ آمین، ل: ٤٩٥**)

وشەی **نشستەتر** لە ڕووی وشەسازییەوە لە دوو بەشی **نشستە** (ئاوەڵناوی دروستکراو لە ڕەگی ڕابردووی (نشستن) + (ه)) بە واتای دانیشتوو و **تر** (نیشانەی ئاوەڵناوی بەراورد) پێک دێت. واتا لەم داڕشتنەدا سوود لەم یاسا وشەسازییە وەرگیراوە:

**[ئاوەڵناو + تر= ئاوەڵناوی بەراورد]**

وەکوو: زیبا (جوان) + تر = زیباتر (جوانتر).

زرنگ (زیرەک) + تر = زرنگتر (زیرەکتر).

بەڵام لە بیر نەکەین کە لە زمانی فارسیدا تەنیا ئەو جۆرە ئاوەڵناوە دەتوانێت بە **ترەوە** ببێ بە ئاوەڵناوی بەراورد، کە لە واتاکەیدا پایە یان ڕادە، مانای هەبێت. چونکە ئاوەڵناوی بەراورد پایەی سیفەتێک لای کەسێک یان شتێک بە بەراورد لەگەڵ شتێک یان کەسێکی تر پیشان دەدات. بۆ نموونە:

مینا زرنگ است اما سیما زرنگتر از اوست. (مینا زیرەکە بەلام سیما لەو زیرەکترە.)

ئەم بەراوردە بە لامانەوە لە ڕووی لۆژیکی ڕستەوە پەسەندە. لە بەر ئەوەی زیرەکی دەتوانێت ڕادە و پلەی جۆراوجۆری هەبێت. بەڵام پلە و ڕادە بۆ ئاوەڵناوی نشستە مانای ڕوونی نییە و خوێنەر سەرقاڵی بیر کردنەوەی قووڵ لە مانای نشستەتر دەکاتەوە. دۆخی وشەکانی دگرتر و دگرسانتر لە نموونەکانی خوارەوەدا هەر بەم شێوەیەیە:

من بگویم به تو آنان که **دگرتر** بودند. (**یک نامه به یک زندانی، ل: ٤٨١**)

بر فراز کوهها و درەهای غمفزای زعفرانی چهره آن

زندگانی **دگرسانتر** (**خانه سریویلی، ل: ٢٦٦**)

بێگومان ئەم وشە و تەرکیبە تازانە هەموو کاتێک نابنە هۆی نادیاریی واتا و هەندێ جار شاعر تەنیا مەبەستی ئەوەیە کە لە سیما کۆنەکەی وشەکان لابدات و هەندێ جاریش پێیانەوە جۆرە بەرجەستەسازییەک (stress) دێنێتەدی بۆ ئەوەی پێیەوە سەرنجی خوێنەر بۆ دەقەکە ڕابکێشێت. لە نموونەکانی خوارەوەدا ئەو تەرکیبە دەگمەنانەی لەلایەن شاعیرەوە بەکارهێنراون و ئەوانەش کە بە هۆیانەوە شاعیر لە بەکارهێنانیان لادەدات دەخەینە ڕوو[1]:

– می دهد **قصه** مردی بازم

سوی دریایی دیوانه سفر (**مانلی**، **ل**: **٣٥١**) [سفر دادن له جیاتی روانه سفر کردن]

– چو می افکند بەهر آوا گوش (**هەمان**، **ل**: **٣٥٣**) [گوش افکندن له جیاتی گوش دادن]

– باد از جا شده زین سوی بدان سوی رها داد لجام (**هەمان**، **ل**: **٣٥١**)

[رها دادن له جیاتی رها کردن]

......

• **زیندووکردنەوەی شێوازە کۆنەکانی ڕستەسازیی شیعری**

ئەوە نەبێ بڵێین بەرهەمی نیما تەنیا دیاردەی تازە دەگرێتەوە خۆی. نە نیما و نە هیچ شاعرێکی تر ناتوانێت بە تەواوی خۆی لە هەموو ڕێوشوێن و ئامرازەکانی شیعری کۆن لابدات. بەرهەمی نیما سەرەڕای تازەییەکەی، لەسەر بنەمای کەرەستە و شێوازە کۆنەکانیش دامەزراوە. واتا بە شێوەیەکی ڕەها بەرپەرچی هونەری شیعری کۆن نەداتەوە؛ بەڵکوو هەوڵ دەدات بە ئاوایەکی جیاواز سوودی لێ ببینێت. یەکێتیی نێوان بنەما و کەرەستە کۆن و تازەکانی شیعری، جوانییەکی تایبەت دەبەخشێتە بەرهەمی شیعری نیما. بە تایبەتی کاتێ کە کەرەستە کۆنەکانیشی بژاردە بن. جێگۆڕکێی کەرەستەکانی ڕستەی شیعری یەکێکە لەم دیاردانە:

---

(١) پورنامداریان، ت، (١٣٨١/٢٠٠٢)، ص ١٤٩-١٥٠.

ـ همچنان کاندر غبار اندوده اندیشه های من ملال انگیز [ له جیاتی: اندیشه های غباراندود و ملال انگیز من ] (**اجاق سرد**: **ل ٤٥٣**).

له نموونەی سەرەوەدا کە فرێزێکی ناوییە، شوێنی دیارخەر و دیارخراو و خستنەسەر چەند جار لێک گۆڕاوەتەوە. لە دوو نموونەی خوارەوەشدا:

ـ تیرپروازی به سنگین خواب روزانش زمستانی [له جیاتی: خواب سنگین روزان زمستانیش] (**خواب زمستانی**: **ل ٢٩٧**)

ـ با تنش گرم بیابان دراز [لەجیاتی: با تن گرمش] (**هست شب**: **ل ٥١١**).

بە هەمان شێوە جێگۆڕکێ لە نێوان کەرەستەکانی ڕستە وەکوو دیارخەر و دیارخراو و خستنە سەر و... کراوە. هەندێ جاریش کەرەستە لێکدراوەکانی ڕستە لە یەکتر جیا و دوور دەکرێنەوە. وەکوو لە دێڕە شیعرییە کانی خوارەوەدا دیارە :

ـ هیچ آوایی نمی آید از آن مردی که در آن پنجره هر روز
چشم در راه شبی مانند امشب بود بارانی [لەجیاتی: شبی بارانی]
(**روی بندرگاه**: **ل ٥١٠**)

ـ می دهد قصه مردی بازم
سوی دریایی دیوانه سفر[له جیاتی: سفرم می دهد] (**مانلی**: **ل ٣٥١**)

هەندێ جاریش نیما لە جیاتی کاری گەردان کراو ـ بە پێی کەس و کات ـ چاوگ بە کار دێنێت. وەکوو لەم دێڕە شیعرییانەی خوارەوەدا دیاردەبێت:

ـ کهنه خواهد شدن آنچه خیزد [له جیاتی: خواهد شد] (**افسانه**: **ل ٥٨**).

ـ من با هوس بی ثمر تندروان
دیگر کاریم نخواهد بودن [له جیاتی: نخواهد بود] (**پریان**: **ل ٢٧٥**)

ئەم جۆرە بەکارهێنانانە و زۆری تریش، سامانی بەجێماوی شیعری کلاسیکی فارسین. بەڵام تازەییەکەی لەوەدا خۆی دەنوێنێت کە

لای نیما بژارده و ناسراون و به فراوانی له بەرهەمەکەیدا دووباره دەبنەوە. بێگومان ئەم فراوانییەش بە حەز و ئارەزووی شاعیرەوە بووە و بە ئەنقەست ئەنجام دراوە. زۆرجار، بە کارهێنان و تێکەڵاوکردنی لە ڕادەبەدەری ئەم دیاردانە دەبێتە هۆی سەر لێشێواندنی خوێنەر و بزرکردنی سەرەداوی واتای شیعری. ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی شیعری نیما _ بە پێچەوانەی شیعری کلاسیک کە سەرچاوەی ئەم دیاردانەیە! _ لە لایەن هەندێ لە ڕەخنەگرانەوە بە شیعرێکی ناڕێزمانی و نیماش بە شاعرێکی فارسی نەزان یان شاعرێکی بێ توانا لە قەڵەم بدرێت[1]!

## وێنەی سەمبۆلیك، باوترین وێنەی شیعری

ڕەمز (symbol) وەکوو وێنەیەکی خەیاڵی شیعری، جگە لە واتا فەرهەنگییەکەی، هێمایە بۆ واتایەکی تر کە بەڕێکەوتن یان بێ ڕێکەوتن و بە خواستی تاکە شاعرێک بۆی تەرخان دەکرێت. کە واتە دەشێ دوو دەستە یان جۆری ڕەمزی شیعری دەستنیشان بکرێت. دەستەی یەکەمیان ئەوانەن کە گشتین و لە بەر ئەوەی ناسراون، واتا هێماییەکەشیان ناسراوە. دەستەی دووەمیان ڕەمزە تایبەتییەکانن کە بەرهەمی داهێنانی شاعیرن و تەنیا لە لایەن ئەو شاعیرە و بۆ ئەو واتایەی ئەو مەبەستیەتی دانراون. دەستەی دووەمی ڕەمزەکان لە بەر نەناسراویان جۆرە تارماییەک بە واتای شیعری دەبەخشن و بۆ خوێنەر کە ناچارە شییان بکاتەوە، تازە و نوێ دێنە بەرچاو[2].

---

(١) سەرچاوەی پێشوو، ص **١٤٠– ١٦٢**. هەروەها بڕوانە: محمدی، ح، *شعر نو نیمایی، سیری در قالبهای نوین شعر فارسی*، تهران، نشر چشمه، **٢٠٠٢/١٣٨١**، ص **٢٣–٢٤**. و پورچافی، ح، *جریانهای شعری معاصر فارسی، از کودتای* ***١٣٣٢*** *تا انقلاب* ***١٣٥٧***، تهران، مؤسسه انتشارات امیر کبیر، **٢٠٠٥/١٣٨٤**، ص **١٣٧**.

(٢) شمیسا، س، (٢٠٠١/١٣٨٠)، ص ٧٥-٧٧.

شیعری نیما پڕە لە ڕەمز. وەکوو خوێنەرێکی بەردەوامی شیعری سەمبۆلیستی فەڕەنسی، بۆ ئەفراندنی وێنەی شیعری تایبەت، هەوڵ دەدات لە شیعرەکانیدا ڕەمز لە جۆری دەستەی دووەم بە کار بێنێت. دوور لە وێنەگەلی شیعری کلاسیک بە ڕەمزە ناسراوەکانییەوە، نیما دەیەوێت لە سروشت وەکوو سەرچاوەی ڕەمزەکانی سوود ببینێت و لە ڕوانگەیەکی تازەوە تەماشای دەوروبەری خۆی دەکات. ئیتر سروشت بە کەرەستەکانییەوە سەرچاوەیەکی لاوەکیی وێنەسازی نییە و نیما بەرپەرچی ئەو دوورییە دەداتەوە کە لەنێوان شاعیر و کەرەستەکانی سروشتدا لەپێناو دروست کردنی وێنە و ڕەمزی شیعری گشتی هەبوو[1].

لەچوارچێوەی سەمبۆلیسمی سۆسیالدا (ڕەمزگەرایی کۆمەڵایەتی)، نیما دەربڕی هەستە قووڵەکانی دڵ و دەروونی خۆیەتی کە بۆی ناخرێنە ناو قاڵبی وێنە شیعرییە ناسراو و کۆنەکان. زۆربەی هەرە زۆری شیعرەکانی کە پاش *ققنوس* هۆنراون، سەمبۆلیکن (ڕەمزین) و نیما لە نامەیەکدا بۆ مبشری ناوێک لە **١٩٤٥/١٣٢٤** ئاماژە بەو ڕاستیە دەکات:

**شیعری افسانە شێوازێکی هەیە کە خەڵکی حەزیان لێیە، بە پێچەوانەی قیتعە هەنووکەییەکانم کە سەمبۆلیک و بە سەبکی شیعری ئازادن، لە تێگەیشتنیان نزیکە**...[2]

چڕوپڕی ڕەمزەکان ئەگەری قورس بوونی شیکردنەوەی شیعرەکانی نیمایە. بەڵام ئەم دیاردەیە بۆ خۆدزینەوە لە دەربڕینی ڕیالیستی و ڕاستەوخۆ نییە. بەڵکوو ئەو جوانی و سەنگەی ڕەمز بە شیعر دەبەخشێت، مەبەستی شاعیرە کە بە لایەوە ڕەمز باشترین ئامرازی پێناسە و وەسفی (description) شیعرییە. بەلای نیما شیعر

---

(١) فلکی، م، (١٩٩٤/١٣٧٣)، ص ٥٠.

(٢) یوشیج، ن، *نامە های نیما یوشیج*، گردآوری و تدوین طاهباز، س، تهران، نشر آبی، **١٩٨٥/١٣٦٤**، ص ١٦٥.

نابێت هەر لە خوێندنەوەی یەکەمەوە شیاوی تێگەیشتن بێت و ئەم ئامانجەش بە بڵاوبوونی کەش و هەوایەکی ڕەمزی لە سەرتاسەری شیعرەکەدا دێتەدی[1]. بۆ نیما، هەر شتێک لە خۆیەوە شیاوی ئەوەیە ببێ بە ڕەمز و ئامرازی هەست و هزرەکانی شاعیر. لە دار، بەرد، گیانلەبەر و هەر ڕەگەزێکی تری سروشت ڕەمزی تایبەتی دروست دەکات. هەرچەندە ڕەمز و ڕەمزگەرایی (symbolism) لە شیعری فەڕەنسیی کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەمدا ڕامان و مانایەکی تری هەیە و لە ڕەمزی شیعری نیما جیاوازە، بەڵام دەکرێ حەزی نیما لە بەرانبەر ئەم کەرەستە شیعرییە بە جۆرێک لە کاریگەریی سەمبۆلیستە فەڕەنسییەکان و بە تایبەتی بۆدلێر کە بە دەسپێشخەریان لە قەڵەم دەدرێت بزانین کە بە لایەوە سروشت پڕە لە دارستانی ڕەمز و مرۆڤ لە نێوانیاندا تێدەپەڕێت[2].

لە شیعری نیمادا هێمای شەو شوێنێکی هەرە دیار و تایبەتی هەیە. لە شیعری کۆندا شەو کاتی پاڕانەوە یان نوێژکردن، ژوانی دیدارە دڵدارییەکان و ماوەی لەخۆچوون و چێژوەرگرتنی سووفیگەرییانەیە. لە شیعری نیمادا بە پێچەوانەوە، شەو بە زۆری هێمای غەمباری و بێزاری لە کاودانی نالەباری کۆمەڵایەتییە، کە لە شیعرە هەرە خۆییەکانی نیمادا بە بێخەوییەکەیەوە بەستراون. بە دەستەوەگرتنی دەستەڵات بە کۆدتاوە لە لایەن رضا خان و جێنشین بوونی کوڕەکەی لە پاش خۆی و دامەزراندنی ڕژێمێکی دکتاتۆریی سەرکوتگەر، وڵات بەرەو ئاسۆیەکی تاریک دەبات و قۆناغێکی سەختی پڕ لە نەگبەتی بۆ نیما و گەلی ئێران دەست پێ دەکات. ڕۆژە ڕەشەکانی ئەم ساڵانە و هەستە تاریکەکانی شاعیر لە وێنە شەوییەکانیدا ئیلهام دەرێتین[3].

---

(١) قراگوزلو، م، « ترجمە شبانە، بررسی و بازنمود شعر و اندیشە سیاسی نیما از دریچە شرح شعرهای او» در *یادنامە نیما*، (١٣٧٨/١٩٩٩)، ص ٣٣٧.

(2) FISER, E., *Le Symbole littéraire*, Paris, Rien De Commun, s.d., pp. 140-147.

(٣) هەمان سەرچاوە، ص ٣٧٨–٣٨٧.

شب است،
شبی بس تیرگی دمساز با آن
به روی شاخ انجیر کهن «وگ دار» می خواند به هر دم
خبر می آورد طوفان و باران را. و من اندیشناکم (**شب است**، **ل**: **٤٩٠**)

ئەم بەندە پیشاندەری ئەو شەوە ڕەش و تاڵەیە کە باڵی بە سەر کۆمەڵگادا کێشاوە، شاعریش لە بێ خەوی خۆیدا بیر دەکاتەوە و لە هەمان کاتدا گوێڕایەڵی دەنگی بۆقی بارانە، کە هەواڵدەری هاتنی باران و لافاوە.

قوقولی قو! خروس می خواند
از درون نهفت خلوت ده
از نشیب راهی که چون رنگ خوش
در تن مردگان تواند خون (**خروس می خواند**، **ل**: **٤٢٠**)

لەم بەندەدا کەڵەشێر ڕەمزی سەرەکییە و هێمایە بۆ هاتنەوەی بەیانی. ئاوازی قوقولی قوی ڕاوەدوو تاریکییەکانی شەو دەنێت و موژدەی هاتنەوەی ڕۆژی ڕۆناکی ئازادی دەبەخشێت.

گرم شد از دم نواگر او
سردی آور شب زمستانی
کرد افشای رازهای مگو
روشنایی صبح نورانی

لە شوێنێکی تردا ڕۆشنایی مانگیش هێمای چریسکەی هیوا و ئومێدە کە لە ناوەڕاستی ئاسمانی تاریکدا دەدرەوشێتەوە. بەڵام ڕۆشناییەکەی ئەوەندە بە هێز نییە کە گەل وریا بکات و شاعیریش، نەک لە بەر ڕۆشنایی مانگ، بەڵکوو لە بەر گەلە خەوتوو و بێ ئاگاکەی خەوی لێ ناکەوێت[1].

---

(**١**) دانشور، آ، « بنمایەهای تصویری شعر نیما» در *یادنامە نیما*، (**١٩٩٩/١٣٧٨**)، ص ١٥٠-١٦٣.

می تراود مهتاب
می درخشد شب تاب
نیست یک دم شکند خواب به چشم من و لیک
غم این خفته چند
خواب در چشم ترم می شکند (**مهتاب، ل: ٤٤٤**)

دیاره لە وێنەگەلی نیمادا ڕەمز شوێنی ناوەندی وەردەگرێت و کەرەستەکانی وێنەسازی بە دەورییەوە کۆ دەبنەوە. نادیاریی واتای شیعرەکان بە هۆی تێکڕایی هێماکان سیمایەکی تازە دەبەخشێتە شیعرەکانی نیما کەبە پێچەوانەی شیعری کۆن ـ جگە لە هەندێ شیعری سووفیگەری و ئەمیش بە هۆی نادیاری و تارمایی ئەو حاڵ و بارە دەروونییەی شاعیر لە کاتی چێژدا تووشی دێت ـ دەتوانن زۆرجار شیکردنەوەی جۆراوجۆر بەخۆیانەوە بگرن.

بەم شێوەیە بە درێژی لاپەڕەکانی ئەم بەشەمان، میکانیزمی نوێکردنەوەی شیعری نیمامان بینی. بە ئازادکردنی شیعر لە کۆسپی کێش و سەروای کۆن ـ بە هۆی ئەو ئازادییەی بە شاعیر لە مامەڵەکردن لەگەڵیاندا بە گوێرەی واتا دەدات ـ پێناسەیەکی تازە بە یاساکانی کێش و سەروا دەبەخشێت کە زیاتر گرنگی بە لایەنە سێمانتیک و تاکەکەسییەکەی شیعر دەدات. لەمەودوا ئیتر بەشە جیاجیاکانی وتەی شیعرین کە سەروای خۆیان بە سەر شاعیردا دەسەپێنن.

داهێنانەکەی لە بواری زمانی شیعریدا ڕەسەنایەتی و مودێرنیسم پێکەوە گرێ دەدات و بە سوود وەرگرتن لە ڕەمز و وێنەی ڕەمزی نوێ و تایبەتی، وێنەگەلی خۆی لەسەر بنەمای سروشت وەکوو سەرچاوە و ڕۆڵی کۆمەڵایەتیی شاعیر وەکوو ئامانج دادەمەزرێنێت و بەم ئاوایە شیعری فارسی بەرەو بەتاکەکەسی و تایبەتی کردنی وێنەی شیعری دەبات.

# بەشی دووەم

## پێشەکی: بەرەو تازەکردنەوەی شیعری کوردی

- شیعری کلاسیکی کوردی، لە دەروازەی قۆناغێکی تازەدا
- شیعری کوردیی هاوچەرخ
- عەبدوڵلا گۆران، شاعرێکی تێکۆشەر و بەرهەمێکی پێگیر

### بە دوای ناسنامەی نەتەوایەتیی شیعر

- شیواندنی قاڵبە کلاسیکە ناسراوەکان
- ڕزگاری لە کۆسپی قاڵبە کلاسیکەکان
  - کێشی عەڕووزیی ئازاد
  - دابڕان لە کێشی بیانی
  - داهێنانی کێشی بڕگەیی نوێ
  - کێشی بڕگەیی ئازاد
  - کێشی تێکەڵاو
- سەروا
  - دەسکاریی سیستەمی کلاسیک
  - سەروای شیعری فۆلکلۆریی کوردی یان سەروای مەسنەوی؟
    - شیعر بە کێشی عەڕووزی

- شیعر بە کێشی بڕگەیی
- شیعر بە کێشی تێکەڵاو
- شیعر بە کێشی ئازاد
  - سەروای تێکەڵاو
  - سەروای ناوبەناو

## زمانی شیعریی گۆران

- بە کوردی کردنی وشە گەلی شیعری
- بە کارهێنانێکی نوێی وشە و زاراوەی بیانی
- بە کارهێنانی (onomatopoeia) و (interjection)
- سیستەمی ڕستەسازیی سادە و دوورەپەرێزی لە تارمایی واتایی
- لێکچواندن، باوترین وێنەی شیعری

# پێشەکی: بەرەو تازەکردنەوەی شیعری کوردی

## شیعری کلاسیکی کوردی، لە دەروازەی قۆناغێکی تازەدا

لــە دایکبــوونی هونــەری نووســین لــە ئــەدەبی کوردیــدا وەک لــە زۆرینــەی ئەدەبــەکانی جیهانیــدا، بــە شــیعرەوە بــووە. لەوانەیــە ســەرهەڵدانی شــیعری کــوردیش ئەوەنــدەی ســەرهەڵدانی شــیعری نەتــەوەکانی تــری ناوچــەکە ــ وەکــوو عــەرەب و فــارس ــ کــۆن بێــت و بگرە زیاتریش. بەڵام ئەو زانیارییانـەی تـا ئێسـتا بـە ڕەنـج و کۆششـی مێژوونووســان و ڕەخنــەگرانی ئــەدەبی کــوردی لــە بەردەســتماندان، جــارێ وا پیشــان دەدەن کــە بــە هــۆی کۆمەڵێــک هۆکــاری ژیــانی کۆمەڵایــەتی، ڕامیــاری و ئــابووریی کوردســتان، پەیــدابوونی شــیعری نووسراوی کوردی درەنگتـر لـە هـی شـیعری فارسـی و عـەرەبی بـووە. هەر لە بەر ئـەم هۆیانەشـە کـە تـا ئێسـتاش سـەرەتاکانی پەیـدا بـوونی شیعری کوردی بە تەواوی ساغ نەبۆتەوە و بیروڕاکان لە بارەیەوە لـە یــەک جیــاوازن. بــۆ نموونــە ژمارەیــەک لــە مێژوونووســانی شــیعری کــوردی ــ وەکــوو علاءالــدین ســجادی و مــارف خەزنــەدار ــ لــەو بــاوەڕەدان کــە باباتــاهیری هەمــەدانی کــە لــە نێــوان (**٩٣٥-١٠١٠**)ی زاییینیــدا ژیــاوە و شــیعرەکانی بــە زاراوەی لــوڕین، یەکــەم شــاعیری کلاسیکی کوردە. بەڵام بۆرەکەیی لە کتێبە دوو بەرگییەکەیدا، *مێژووی وێژەی کوردی*، بـە پشـت بەسـتن بـە سـروودە ئایینییـەکانی یارسـان، سەرهەڵدانی شیعری کلاسیکی کوردی بۆ سـەدەکانی دووەم و سێیەمی کۆچــی دەگەڕێنێــتەوە و بــە لایــەوە بــالوولی مــاهی، بابــە ســۆرەی

لوڕستانی و بابە ڕەجەبی لوڕستانی لە یەکەم شاعیرانی کوردن[١] و دەکەونە پێش باباتاهیر. شایانی وتنە کە بە زۆری پەیدابوون و پەرەسەندنی شیعری کوردی پێوەندیی بە پەیدابوونی دەسەڵاتە ناوچەییە کوردییەکانەوە هەبووە کە لە قۆناغە جیاوازەکانی مێژووی کوردستاندا لە شێوەی میرنشیندا و لە ناو جەرگەی ئیمپراتۆریی عوسمانیدا پەیدا بوونەتەوە و ڕۆڵێکی کاریگەریان لە گەشەپێدانی شیعری کوردیدا گێڕاوە. شیعری کلاسیکی کوردی لە سەدەی چواردەهەمەوە بە زاراوەی کوردیی کورمانجی سەروو گەشە دەستێنێت. لە سیما هەرە دیارەکانی ئەم بەشە دەتوانین ئاماژە بە مەلای جزیری، ئەحمەدی خانی و عەلی حەریری بکەین. لە سەدەی هەڤدەی زایینییەوە شیعری زاراوەی کوردیی گۆرانی بە بەرهەمەکانی بێسارانی، مەلای جەباری، مەولەوی و... نوێنەرایەتیی شیعری کلاسیکی کوردی دەکات. لە سەدەی نۆزدەیەمیشەوە مێژووی شیعری کلاسیکی کوردی بە بەرهەمەکانی نالی و سالم و کوردی و دەیان شاعیری دیکەی سەر بە زاراوەی کوردیی کورمانجی خواروو گەشاوە و دەوڵەمەند دەبێت. شیعری ئەم قۆناغە بە پێچەوانەی شیعری کلاسیکی زاراوەکانی تر تووشی دابڕان نابێت و شاعیران تا سەردەمی شیعری نوێ لە داهێناندا بەردەوام دەبن. ئەم قۆناغە لە ڕووی ژمارەی شیعر و شاعیریشەوە لە قۆناغەکانی تر دەوڵەمەندترە[٢].

---

(١) بڕوانە: بۆرەکەیی، ص، *مێژووی وێژەی کوردی*، بەرگی ١، انتشارات ناجی، بانە، ١٣٧٠؛ خەزنەدار،م، *مێژووی ئەدەبی کوردی*، بەرگی یەکەم، هەولێر، ئاراس، ٢٠٠١، ل ١٥٨-١٦٠.

(٢) بۆ زانیاری زیاتر لە سەر شاعیران و بەرهەمەکانیان بڕوانە: سەجادی، ع، *مێژووی ئەدەبی کوردی*، چاپخانەی مەعاریف، بەغدا، ١٩٧٢؛ خەزنەدار،م، (٢٠٠١)؛ ڕەفیق حلمی، *شیعرو ئەدەبیاتی کوردی*، بەرگی ١و٢، چ دووەم، هەولێر، ١٩٨٨؛ ئامێدی، ص، *هۆزانڤانێت کورد*، بەغدا، کۆری زانیاری عێراق، ١٩٨٠؛

KURDO, Q., *Tarixa edebîyata kurdî*, Stokholme, Roja Nu, 1983.

سەرەڕای جیاوازییە زاراوەییەکان، هەندێ تایبەتمەندیی گشتی باڵیان بە سەر شیعری کلاسیکی کوردیدا کێشاوە کە لە شیعری عەرەبی و بە زۆری لە شیعری کلاسیکی فارسییەوە سەرچاوە دەگرن. هاوکات لەگەڵ خویندنی وانە ئایینی و زانستە قورئانییەکان لە مزگەوت، تەکیە یان لە مەکتەبدا، زۆربەی هەرە زۆری شاعیرە کوردەکان هەر لە منداڵییەوە فێری زمان و ئەدەبیاتی فارسی دەبوون و بەرهەمی گەورە شاعیرانی فارسی وەکوو حافظ و سعدی، جلال الدین رومی،... هاودەمیان بوو. دیوانی شیعری شاعیرە بەناوبانگەکانی کورد جزیری، نالی، سالم... شایەتی کاریگەریی شیعری کلاسیکی فارسی لە سەر خاوەنەکانیان دەدەن[١]. بۆیە شیعری کلاسیکی کوردی ــ شیعری زاراوەی گۆرانی نەبێت ــ هەر لە سەرەتای سەرهەڵدانییەوە هەندێ لە تایبەتمەندییە ڕوخسارییەکانی شیعری عەرەبی و فارسیی گرتەوە خۆی. ئێمەش بە گوێرەی پێویستیی باسەکەمان بە کورتی باسیان لێوە دەکەین[٢].

شیعری کلاسیکی کوردی بە کێشی عەرووزی عەرەبییەوە هۆنراوەتەوە. کەچی ئەم کێشە لە ڕێگای شیعری فارسییەوە هاتۆتە ناو شیعری کوردییەوە. عەزیز گەردی لە کتێبێکیدا کە بۆ کێشی شیعری کلاسیکی کوردی و بەراوردی لەگەڵ عەرووزی عەرەبی و شیعری کلاسیکی فارسیدا تەرخانی کردووە، ڕاستیی ئەم بابەتە دەسەلمێنێت کە شاعیرە کوردە کۆنەکان لە وەرگرتن و دەستکاری کردنی کێشە عەرووزییەکاندا لە ژێر کاریگەریی

(١) عارف، م، « تەئسیری زمان و ئەدەبی فارسی لە سەر ئەدەبی کوردی» لە *گۆڤاری کۆلێژی ئەدەبیات*، ژمارە ١٨، بەغدا، زانستگای بەغدا، **١٩٧٤**، ل **٧٢–٧٨**؛ میراودەلی، ک، « سەرەتایەک بۆ لێکۆڵینەوەی شێعری کلاسیکی کوردی» لە *دیداری شیعری کلاسیکی کوردی*، ئامادەکردنی حەمە کەریم، ح، بەغدا، دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، **١٩٨٦**، ل **٦٩–٧٠**.

(٢) شیعری کلاسیکی کوردی زاراوەی گۆرانی هەندێ لەم تایبەتمەندییانە ناگرێتەوە خۆی و دواتر باسی لێ دەکەینەوە.

شاعیره فارسەکاندا بوون[١]. بەلاّم کاریگەرییەکە هەر لە سنووری کێشدا ناوەستێت و لە بوارەکانی تری ڕوخساری شیعری کوردیشدا خۆی دەنوێنێت. لە ئاستی وشەی شیعریدا، لە تەنیشت وشە عەرەبییە بەکارهێنراوەکان، وشەگەلێکی بەرچاوی فارسیش جێی خۆی لە شیعری کلاسیکی کوردیدا دەکاتەوە. کاتی خۆی بەکارهێنانی ـ هەندێ جار فراوانی ـ وشە و زاراوەی عەرەبی و فارسی و تەنانەت تورکیش، نە تەنیا جێی ڕەخنە نەبوو، بەڵکوو نیشانەی شارەزایی و کارامەیی شاعیر بوو لەم بوارەدا[٢]. قاڵبە شیعرییەکانیش بریتی بوون لە غەزەل، قەسیدە، قیتعە، موسەممەت، موستەزاد، چوارینە (رباعی)، تەرجیع بەند و تەرکیب بەند، کە بە هەموو جۆرە تەکسەروایی و یەکپارچەکان (وەکوو غەزەل و قەسیدە) و چەند سەروایی و بەندبەندەکانەوە (وەکوو تەرجیع بەند و تەرکیب بەند)، پێشتر جێی خۆیان لە شیعری فارسیدا کردبووەوە و هەر هەموویان پێڕەوییان لە یاسای یەکێتی کێش لە سەرانسەری شیعردا دەکرد[٣]. لە ڕووی وێنەی شیعریشەوە، شاکاری گەورە شاعیرانی کلاسیکی فارس کە پڕن لە نموونەی جوانی هونەرەکانی ڕەوانبێژی، جوانکاری و واتاناسی، بووبوون بە سەرچاوەی بەهرەی شاعیرە کوردە کلاسیکەکان[٤]. ئەم چەند ڕێزەی خوارەوە پیشان دەدەن تا چ ڕادە گۆران هەست بە کلێشەیی بوونی شیعری کلاسیک لە ڕووی یاساکانی دارشتنی ڕوخساری دەکات کە لە لاسایی کردنی بنەما ڕوخسارییەکانی شیعری عەرەبی و فارسییەوە سەرچاوە وەردەگرن:

---

(١) گەردی، ع، *کێشی شیعری کلاسیکی کوردی و بەراورد کردنی لە گەڵ عەرووزی عەرەبی و کێشی شیعری فارسیدا*، هەولێر، وەزارەتی رۆشنبیری، ١٩٩٩، ل ٢٨٨-٣٢٧.

(٢) عارف، م، (١٩٧٤)، ل ٨٠.

(٣) عەلی، د، *بنیاتی هەڵبەست لە هۆنراوەی کوردیدا*، سلێمانی، ڕەنج، ١٩٩٨، ل ١٠٤-١١٦.

(٤) خەزنەدار، م، موجز *تاريخ الادب الكردي المعاصر*، ت. شیخۆ، ع، حلب، ١٩٩٣، ص ٤٢.

**له هەڵبەستی کۆنا شەقڵی لاسایی بە ئوسلوبەوە ئاشکرایە، لە قاڵبا کەس نەیویستووە لە نەریتی مامۆستا پیشەیییەکان لابدات، غەزەل هەر ئەبێ ژمارەی بەیتەکانی تاک بێ و لە (١٥) بەیت تێنەپەڕێت، قەسیدە ئەبێ لە سەر یەک قافیە تەواو بێت و، هەموو دەربڕینەکانی ئەبێ هەر کلێشەی پێشینان بن: نێرگسی شەهلا و، هێلانەی سەمەندەر**[1].

خودی گۆران بەتەواوی ئاگاداری ڕۆڵی زمان و شیعری فارسی لە بەدیهاتنی هونەری شیعری کلاسیکی کوردیدایە و دەڵێت:

... **لە ڕەخنەی وێژەییدا ئەوەی لە سەردەمی کۆنا لە عەرەبیمان وەرگرتووە زۆرتر لە ڕێگای زمانی فارسییەوە پێمان گەیشتووە، جگە لەوەش نزیکی زمانی کوردی لە فارسی و هاوبەشیی ئەم دوو زمانە لە یەک سەرچاوەی (میثۆلۆژی _ عیلمی أساطیر _ ئەفسانەدا) و لە یەک سەردەمی مێژووی کۆنا، لە گەڵ تێکچوونی چێژی هونەریی هەردوو لامان ئەم پەیوەندییە گرنگانە گشتیان پێویستییەکی تەواو پێویست ئەخەنە سەرشانی نەک تەنها وێژەوانەکان و ڕەخنەوانەکان؛ بەڵکو هی هەموو ڕۆشنبیرێکی کوردی وێژە دۆست، کە تەقەللا بدات بۆ فێربوونی زمانی فارسی و شارەزایی پەیداکردن لە وێژەی فارسیدا**[2].

هەروەها کاتێ باس لە کێشی شیعری کوردیی هاوچەرخ بە کلاسیک و تازەکەیەوە دەکات، لە بارەی وەرگرتنی کێشی عەرووزی عەرەبی لە ڕێگای شیعری فارسییەوە دەڵێت:

**لە هەڵبەستی تازەی زمانی کوردیدا دوو ڕێچکەی جیاوازی کێش هەیە، ڕێچکەی یەکەم؛ ئەو بوێژانە لە سەری ئەڕۆن، کە پەیڕەوی بوێژە کۆنەکانمان ئەکەن، کە لە سەردەمی زۆر کۆنەوە لە ڕێگای وێژەی فارسییەوە هەندێ دەریایان لە کێشی عەروزی عەرەبییەوە وەرگرتووە،**[3]...

یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی شیعری کلاسیکی کوردی لەوەدا بەرجەستە دەبێت کە کاریگەریی شیعری کلاسیکی عەرەبی و فارسی بە

---

(١) ئاشنا، ئ، *گۆران، نووسین و پەخشان و وەرگێڕاوەکانی*، هەولێر، ئاراس، ٢٠٠٢، ل ٣١.

(٢) هەمان سەرچاوە، ل ١٤١.

(٣) هەمان سەرچاوە، ل ١٥٧.

هەموو لایەنەکانییەوە بەو ڕادەیەی کە بە سەر شیعری کوردیی زاراوەکانی کورمانجی سەروو و خوارووودا هەیە، بە سەر شیعری کلاسیکی کوردیی زاراوەی گۆرانیدا نابینرێت. هۆیەکەشی بۆ سروشتی ئەو ناوچەیە دەگەڕێتەوە کە ئەم زارە تێیدا بە کار دێت. ناوچەیەکی سەخت و شاخاوی کە هاتۆچۆی زۆر ئەستەمە. ئەوەش وای کردووە کە پێوەندیی دانیشتووانی ئەم ناوچەیە لە گەڵ کولتوورە جیاوازەکانی دەوروبەر بە ڕادەی ناوچەکانی دیکەی کوردستان نەبێت. کەمی تێکەڵاوی بۆتە هۆی پاراستنی زیاتری تایبەتمەندییەکانی فەرهەنگی خۆماڵیی خەڵک لە چاو ناوچەکانی دیکە. شوێندەستی ئەم دیاردەیە لە بواری شیعریشدا بەوە دیارە کە سەرچاوەی بەهرەی شاعیرانی ئەم ناوچەیە زیاتر سامانی ئەدەبی سەرزارەکیی خۆیان بووە. ئەم ئەدەبە (ئەدەبی سەرزارەکی یا خود فۆلکلۆری) کە بە شێوەیەکی گشتی و لە ئاستی هەموو ناوچەکانی کوردستاندا زۆر دەوڵەمەندە، لە ڕووی شیعرەوە بە جۆرە سەرەکییەکانی ستران، بەیت و لاوک و حەیران دەستنیشان دەکرێت. داهێنەرانی ئەم شیعرانە دیار نین و شیعرەکان لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر و لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر بە شێوەی سەرزارەکی ڕاگوێزراونەتەوە. لە کۆی ئەم جۆرە شیعرییانە تەنیا سترانە کە قاڵب و سەروای تەواو یەکگرتووی هەیە؛ کەچی بەیت و لاوک و حەیران قاڵبێکی تەواو یەکگرتوویان نییە و سەرواکەیان ناوبەناوە[1].

| | |
|---|---|
| های نەرمێ/ نەرمێ نەرمێ | های نەرمێ / نەرمێ نەرمێ |
| بابێ نەرمێ / **فەلەیە** | نەرمێ نا/دەتە **مەیە** |
| ئەو نەرمینا / **تیاری** | بشێخادی / دگەل من **یاری**[2]... |

**(٣+٤ یان ٤+٣)**

(١) بۆ زانیاری زیاتر لەمبارەیەوە بڕوانە: خەزنەدار، م، *کێش و قافیە لە شیعری کوردیدا*، بەغدا، الوفاء، **١٩٦٢**.

(٢) بەرواری، ک، *پەروا چیا*، بەغدا، ئەمینداریا گشتیا ڕۆشنبیری و لاوان، **١٩٨٦**، ل **٦٥-٦٧**.

کێشی شیعری فۆلکلۆریی کوردی بە گشتی کێشێکی بڕگەییە. لە ستراندا یەکسانیی ژمارەی بڕگەکان لە دوو نیوەدێڕی شیعردا و دابەشبوونیان بە سەر کەرتی یەکساندا کێشەکە بەدی دێنن. نیوەدێڕەکانیش بە سێ جۆر کەرت دەکرێن. نیوەدێڕی دە بڕگەیی (**٥+٥**)، نیوەدێڕی هەشت بڕگەیی (**٤+٤**) و نیوەدێڕی هەفت بڕگەیی (**٤+٣** یان **٣+٤**). لە ڕووی سەرواشەوە ـهەروەکوو لە نموونەی سەرەوەشدا دیارە ـ زۆربەی جاران نیوەدێڕەکان دووبەدوو ـ وەکوو سەروای مەسنەوی (aa bb cc ..) ـ هاوسەروان. ئەم سەروایە لە جۆرە هەرە باوەکانی سەروای شیعری سترانی کوردییە. لە ڕووی زمانەوە ئەم شیعرانە سادەن و دوورن لە هەر جۆرە تارمایی واتایی و بە دەگمەن نەبێت وشەی بیانییان تێدا نابینرێت و باوترین وێنەی شیعرییان بریتیە لە لێکچوواندن (تشبیه)[1].

**ئەگەر نەبوایە / لە لۆمەی وڵات کەپرێکم دەبەست / شەو و ڕۆژ لە لات** (٤+٤)

شیعری کوردیی زاراوەی گۆرانیش کە لە ڕووی تایبەتمەندییەکانی ڕوخسارەوە لە شیعری گۆرانیی خەڵک بەهرە وەردەگرێت، بە کێشی دەبڕگەیی (**٥+٥**) نووسراوەتەوە.

**شینم بگرین / شیوەنم خەیلی تەرمم بوەشین / وە زلفی لەیلی**[2]

سەروای باوی ئەم شیعرەش چ لە غەزەل و چ لە قەسیدەدا هەمان سەروای باوی شیعری سترانە کە وەکوو گوتمان لە سەروای مەسنەوی دەچێت. لەم شیعرەدا لە چاو شیعری زاراوەکانی تر تا ڕادەیەک ژمارەیەکی کەمتری وشەی عەرەبی یا فارسی بە دی دەکرێن[3].

---

(**١**) رسول، ع، *ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی*، بەغدا، دارالجاحظ، **١٩٧٠**، ل **٨**، **١١**-٦٨؛ خەزنەدار، م، (**١٩٦٢**)، ل **٣٠**-**٣٦**.

(**٢**) رسول، ع، (**١٩٧٠**)، ل **٣٠**-**٣٧**.

(**٣**) گەردی، ع، *سەروا*، هەولێر، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، **١٩٩٩**، ل **٢٦٢**-**٢٩٢**؛ خەزنەدار، م، (**١٩٩٣**)، ل **٢٩**.

## شیعری کوردیی هاوچەرخ

نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم، هاوکات بوو لە گەڵ لە دایکبوونی قۆناغێکی تازە لە مێژووی شیعری کوردیدا. شەڕی یەکەمی جیهانی و دابەشبوونی کوردستان بە سەر چوار وڵات، کاریگەریی خراپیان کردە سەر ژیانی گەلی کورد و هەستی نەتەوایەتیی لە لای کوردان پتەوتر کرد. ئەمە بە درێژایی ئەم سەدەیە لە ناوچە جیاجیاکانی کوردستاندا، وردەوردە بوو بە بناغەی چەندین بزووتنەوەی ڕزگاریخواز. پەیدابوونی ڕۆژنامەنووسیی کوردی و پەرۆشی ڕۆشنبیرانی کورد بۆ ناسینی فەرهەنگ و ئەدەبی بیانی بە تایبەتی ئەدەبی تورکی و ڕۆژئاوایی، لە تایبەتمەندییە کولتوورییەکانی سەرەتای سەدەی بیستەمن. بێگومان گۆڕانکارییە ڕامیاری و جڤاکییەکان ڕەنگدانەوەی خۆیان لە ئەدەب و بە تایبەتی لە شیعردا هەبوو. ئەمەش زیاتر لە ڕووی بابەتییەوە لە شیعردا بەرجەستە دەبوو. بابەتە کلاسیکەکانی لیریک، تەسەوف، پەسن و ستایش و ئامۆژگاری شوێنی خۆیان دایە بابەتی نیشتمانی و نەتەوایەتی و خۆشەویستیی وڵات و گیروگرفتە ڕامیاری و کۆمەڵایەتییەکان[1]. لەم ڕووەوە شیعرە نیشتیمانییەکانی حاجی قادری کۆیی و هۆنراوە کۆمەڵایەتییەکانی پیرەمێرد پێشڕەوی شیعری کۆمەڵێک لە شاعیرانی سەرەتای سەدەی بیستەم بوون کە لە ڕووی ناوەرۆکەوە زیاتر لە دەوری ئەم بابەتانەدا دەسوڕانەوە؛ وەکوو ئەثیری، زیوەر، بێکەس،[2]....

ڕاستە ناوەرۆکی شیعری کوردی هەر لە زووەوە خۆی لە گەڵ گۆڕانکارییەکانی کۆمەڵگادا گونجاند و بووە ئاوێنەی هەست و نەستەکانی شاعیری سەردەم؛ بەڵام گۆڕانی ڕوخساری شیعر ڕیتمێکی

---

(١) خەزنەدار، م، (١٩٩٣)، ل ٩٥.

(٢) معروف، ك، *الحركة التجديدية في الشعر الكردي الحديث ١٩١٤-١٩٦٥*، القسم الاول، استكهلم، ١٩٩٢، ص ٦٣؛ رەشید، خ، *ڕێبازی ڕۆمانتیکی لە ئەدەبی کوردیدا*، بەغدا، دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاو کردنەوەی کوردی، ١٩٨٩، ل ٥٧-٥٨.

هێواشتری گرتەبەر. دیارە لە یەکەم هەنگاودا و لە گەڵ پەیدابوونی بابەتە نوێیەکاندا، زمانی شیعر شێوازێکی سادەتری گرتەوە خۆی؛ لە بەر ئەوەی شیعرەکان ئاراستەی گشت چین و توێژەکانی کۆمەڵگا دەکران و پێویستییان بە زمانێک هەبوو کە زۆربەی هەرە زۆری خوێنەران لێی تێبگەن. دواتر چەند هەوڵێکی سەرەتایی لە لایەن هەندێ شاعیرەوە بە تایبەتی عبدالرحیم ڕەحمی هەکاری، ڕەشید نەجیب، شێخ نووری شێخ سالّح، قەدریجان... لێرە و لەوێ لە پێناو ڕوخسارێکی تازەی شیعری دران. بۆ نموونە هەکاری لە زۆربەی شیعرەکانیدا سەروای مەسنەویی بە کارهێنا و تیپۆگرافیای شیعری دەسکاری کرد[1]. شێخ سالّح گۆڕانکاریی لە ژمارەی دێڕی هەندێ لە بەندەکانی تەرجیع بەند و تەرکیب بەنددا کرد[2]. ڕەشید نەجیب لە شیعری عشق و خەیاڵدا کە موسەممەتە، وەکوو تاکە ئەزموونێک ژمارەی بڕگەی نیوەدێڕەکانی دووەمی شیعرەکەی دەستکاری کرد. ئەمانە هەموویان بەردی بناغەی تازەکردنەوەی شیعری بوون و لە هەستپێکردنی شاعیران بە پێویستیی بووژاندنەوەی ڕوخساری شیعری سەرچاوەیان وەردەگرت. بەڵام لە گەڵ ئەوەشدا هیچکام لەم هەوڵە سەرەتاییانە نوێنەرایەتیی شیعری نوێی کوردییان بە هەموو واتای وشە نەدەکرد. لە بەر ئەوەی یان بە شێوەیەکی وا بەربڵاو نەبوون و بەرچاو نەکەوتن کە کاریگەرییان لە سەر شیعری پاش خۆیاندا هەبێت، یانیش سەرەڕای بڵاوبوونەوەیان گشتگیر و هەمە لایەنە نەبوون و بەشێکی دیاری شیعرەکانی ئەم شاعیرانەیان بە

(١) بەکر مەحمەد، م، « ئەدگارەکانی نوێکردنەوە لە شیعری ڕەحمی هەکاریدا» لە گۆڤارا *زانکۆیا دهوک*، ژ ٤، دهوک، زانکویا دهوک، **١٩٩٩**، ل **٨٨٠-٨٨٢**.

(٢) بەکر محەمەد، م، « سیما عەرووزیەکانی قۆناغی گواستنەوەی شیعری کوردی» لە گۆڤارا *زانکۆیا دهوک*، ژ ١، دهوک، زانکۆیا دهوک، **١٩٩٨**، ل **٥-١٠**.

خۆیەوە نەدەگرت بۆ ئەوەی نوێنەرایەتیی تیۆرێکی تازەی شیعری بکەن. دەبووایە چاوەڕێی هەوڵە گشتگیر و کارامەکانی گۆران بکرێت بۆ ئەوەی گۆڕانکارییەکی بنەڕەتی و هەمەلایەنە لە ڕوخساری شیعری کوردیدا بەرجەستە ببێت[1].

## عەبدوڵلا گۆران، شاعرێکی تێکۆشەر و بەرهەمێکی پێگیر

عەبدوڵلا بەگ ناسراو بە گۆران لە ساڵی **١٩٠٤** لە شارۆچکەی هەڵەبجەی کوردستان لە دایک دەبێت. لە باوکی فێری خوێندنی قورئان دەبێت و زانستە قورئانییە سەرەتاییەکان لە مزگەوتی پاشای هەڵەبجە دەخوێنێت. دواتر ناوی خۆی لە قوتابخانەیەکی سەرەتایی تورکی دەنووسێت. لە پۆلی چوارەمی سەرەتایی دەبێت کاتێ هەڵەبجە لە لایەن هێزەکانی ئینگلیزەوە داگیر دەکرێت. لە ساڵی **١٩١٩** دا باوکی کۆچی دوایی دەکات. مەحموود بەگی برای لە ساڵی **١٩٢١** دا ڕەوانەی قوتابخانەی زانستی کەرکووکی دەکات. بەڵام لە بەر کوژرانی براکەی، گۆران ناچار دەبێت دەست لە خوێندن هەڵگرێت.

لە ساڵی **١٩٢٥**ەوە تا ساڵی **١٩٣٧** وەکوو مامۆستا لە قوتابخانەی هەڵەبجە دادەمەزرێت. پاشان دەبێتە کارمەندی بەشی ڕێگا و بانی وەزارەتی ئەشغال. بە هۆی بیروباوەرە دژە فاشیزمەکانی لە ساڵی **١٩٥١** دا دەخرێتەوە بەندیخانە. بەڵام ساڵێک دواتر ئازاد دەکرێت و دەگەڕێتەوە سلێمانی و بەرپرسیارەتیی ڕۆژنامەی ژین دەگرێتەوە

---

(**١**) ڕاستە خودی گۆران لە چاوپێکەوتنەوەکەیدا لە گەڵ عبدالرزاق بیمار، شێخ نووری شێخ ساڵح بە سەرۆکی نوێکردنەوەی شیعری کوردی دەژمێرێت، بەڵام هەر لە بەردەوامی قسەکانیدا ڕوونی دەکاتەوە کە لە کۆی ئەو شاعیرانە خۆی یەکەم کەس بووە بیری لە گۆڕینی جۆری کێشی شیعری کوردی کردووە و بە لای ئێمەوە کاریگەریی شیعری گۆران و ڕەنگدانەوەی کاریگەرییەکە لە شیعری پاش گۆراندا زۆر لە هی شاعیرانی پێش خۆی گرنگتر و بەرچاوترە. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: بیمار، ع، « دانیشتنێک لە گەل گۆران دا» لە *گۆڤاری بەیان*، ژ **٢**، بەغدا، **١٩٧٠**، ل **١-٣** و **٣٠**.

ئەستۆ. لە ساڵی **١٩٥٤** دا دیسانەوە دەگیرێت و بە ساڵێک بەند و ساڵێکیش خستنە ژێر چاودێریی پۆلیس سزا دەدرێت. لە ساڵی **١٩٥٦** دا سزاکەی تەواو دەبێت و دەچێتە بەغدا. لە بەر هێرشی حکوومەت بۆ سەر نیشتمان پەروەران، دەگەڕێتەوە کەرکووک و لەوێ بە سێ ساڵ بەند یانیش دانانی هەزار دیناری بارمتە سزا دەدرێت. لەبەر ئەوەی توانای دانی بارمتەکەی نییە دەخرێتەوە بەندیخانە؛ تا لە ساڵی **١٩٥٨** دا لە ئەنجامی سەرکەوتنی شۆڕشی **١٤**ی تەمموز ئازاد دەکرێتەوە. ئینجا دەگەڕێتەوە سلێمانی و ماوەیەک دواتر لە گەڵ شاندێکی میللی سەردانی یەکێتی سۆڤیەتی جاران و چینی میللی و کۆریای دیموکراتی دەکات. لە سەرەتای ساڵی **١٩٥٩** دا دەبێ بە سەرپەرشتی گۆڤاری *شەفەق* و بە ناوی *بەیان* دەری دەکات. تا ساڵی **١٩٦٠** خەریکی ئەم کارە دەبێت؛ بەڵام بە بیانووێک لە کار لا دەدرێت. لە ساڵی **١٩٦٠** دا دێتەوە بەغدا و لە بەشی کوردیی کۆلێژی ئادابی زانکۆی بەغدا وانە دەڵێتەوە و دەبێتە ئەندامی دەستەی نووسەرانی ڕۆژنامەی *ئازادی*. لە سەرەتای ساڵی **١٩٦٢** دا ئاگادار دەبێ کە گەدەی تووشی نەخۆشی شێرپەنجە بووە. پاش نەشتەرگەرییەک لە بەغدا و لە بەر هەڵدانەوەی شێرپەنجەکە ڕوو لە مۆسکۆ دەکات و لە نەخۆشخانەی کرێملین دەکەوێتەوە ژێر چاودێریی پزیشکی. ماوەیەکی کەم پاش گەڕانەوەی بۆ عێراق نەخۆشییەکەی سەرلەنوێ یەخەی دەگرێت و لە بەرەبەیانی ڕۆژی **١٩٦٢/١١/١٨** ماڵاوایی لە گەڵ ژیاندا دەکات[(١)].

گۆران ژیانی شاعیریی خۆی لە ساڵی **١٩٣٠** ەوە دەست پێ دەکات. زانینی کۆمەڵێ زمانی بیانی بۆ گۆران دەلیڤەیێکی زێڕین بوو بۆ دەوڵەمەند کردنی کولتوور و شارەزایی خۆی لە بواری شیعری

---

**(١)** گۆران، *دیوانی گۆران*، کۆ کردنەوە و ئامادە کردنی محمدی مەلا کریم، بەغدا، کۆڕی زانیاری کورد، **١٩٨٠**، ل **٥٤٥-٥٤٩**.

جیهانیدا. دیاره جگه له زمانی کوردی که زمانی دایکی بووه، له زمانەکانی فارسی، عەرەبی، تورکی، ئینگلیزی و ڕووسیشدا سوارچاک بووه. بۆیه جگه له شیعری کلاسیکی کوردی که بێگومان یەکەم سەرچاوەی ئیلهامدەری بووه، شاعیر ئاشنایەتییەکی بەرفراوانی له گەڵ شیعری بیانیدا هەبووه و وەرگێڕانەکانی شایەتی لەم ڕاستییه دەدەن. خۆی له پەراوێزی شیعری (بۆ بلبل، ل **١٠٣**)[1] دا دەڵێت:

**هەڵبەستی To A Skylark، هیی شاعیری به ناوبانگی ئینگلیز پرسی بیش شیللی، سەرچاوەی ئیلهامی ئەم شیعرانەیه**[2].

گۆران شیعرێکی یەڤگینی یەفتۆشینکۆی شاعیری هاوچەرخی ڕووسی به ناوی (باوەڕەکەمان...) به پەخشان وەرگێڕاوەتەوە سەر زمانی کوردی. له شیعری فارسی کلاسیکیشەوە چوارینەکانی خیام، غەزەلێکی حافظ (ئاهەنگی موغان، ل **٤٦٩**) ، شیعرێکی ناصر خسرو (پرسیارێکی ناصر خوسرەو، ل **٤٦٧**) و شیعرێکیشی له هاتف اصفهانی (تەرجیع بەندێکی به ناوبانگ، ل **٤٧١**) وەرگێڕاوه سەر زمانی کوردی. وەرگێڕانەکان هەر بەوە ناوەستن. شیعرەکانی (دوێنێ، ل **٤٤٢**)، (ئامۆژگاری ئیمپریالیزم، ل **٤٤٥**)، (ڕاست بنەوە، ل **٤٤٨**) و (قەیسی شەهید، ل **٤٥٠**)، له شاعیرانی هاوچەرخی عەرەب جبران خلیل جبران، معروف رصافی، جمیل صدقی زهاوی و مهدی جواهری وەرگێڕاون. دیاره شیعری هاوچەرخ زیاتر جێی بایەخی گۆران بووه. به تایبەتی له شیعرەکانی باوکی شیعری نوێی تورکی ناظم حکمت، پێنجیان بۆ گۆران بوونەته سەرچاوەی وەرگێڕان که بریتین له (هەر وەک کەرەم، ل **٤٥٥**)، (له بارەی شیعرەکەمەوە، ل **٤٥٧**)، (نایەڵن بڵێین، ل **٤٥٨**) به شیعر و (پییەر لۆتی، ل **٥٠٣**) و (هەورەکان تێ ئەپەڕن، ل **٥٠٨**) به پەخشان. هەروەها شیعرێکیشی له امین فیضی بک (داخی دڵ بۆ نامیق کەمال، ل **٤٥٩**) وەرگێڕاوه. شیعری هاوچەرخی

---

(**١**) هەموو نموونه شیعرییەکانمان له سەرچاوەی پێشووەوە وەرگرتووه.
(**٢**) هەمان سەرچاوه، ل **١٠٣**.

فارسیش لە وەرگێڕانەکانی گۆران بێبەش نییە. مەسنەوییەکی سیاسیی بە ناوی (داستانی هەیاسی و کاکە عابدین، ل٤٧٤) لە میرزادە عشقی یەوە وەرگێڕاوەتەوە و دوو شیعریش بە ناوەکانی (هێزی گەل، ل٤٧٩) و (خەباتی گەل، ل٤٨١) لە ابی تراب جلی. شیعری (بت، ل٤٨٣) یشی لە فارسییەوە وەر گێڕاوە. بەڵام ناوی خاوەنەکەیی دەستنیشان نەکردووە. بۆ ناساندنی هەندێ لەم شاعیرانە بە خوینەر گۆران پێشەکییەکی کورت لەبارەیان و هۆی هۆنینەوەی شیعرەکەیانەوە دەخاتە بەر دەست خوێنەران. لە پێشەکی مەسنەوییەکەی عشقی دا دەڵێت:

**(عەشقی) شاعرێکی بەهرەدار و نیشتمان پەروەری ئێران بوو، لە تازەکردنەوەی شیعر و ئەدەبی ئێراندا دەستێکی بەرزی هەبوو، بە تایبەتی هەڵبەستە سیاسیەکانی ئەوەندە گەزەندە و کاریگەر بوو کاربەدەستانی سەردەم بۆیان قووت نە ئەدرا، بە رادەیەک کە شاهەنشاهی پێشوو رەزا شای پەهلەوی کەڵەکێکی نهێنی رێک خست بۆ کوشتنی و لە تەمەنی (٣١)ساڵیدا کوژرا.**

**عەشقی کوللیاتی شیعر و پەخشانی چاپکراوی لە سەراسەری ئێراندا برەوێکی نەمری هەیە**[١]...

لە بەردەوامیی قسەکانیشیدا ئاماژە بەو راستییە دەکات کە ئەو گۆرانییەی بە هاوکاری مەحموود جەودەت و م. نوری شاعیری سلێمانی پیکهاتووە ودێڕی یەکەمی بریتییە لە (ئەولادی وەتەن، ئێمە کەوا میللەتی کوردین)، ئاوازەکەی لە پارچەیەک لە ئۆپەرای *رستاخیز شهریاران ایران ی* عشقی یەوە وەرگیراوە[٢].

پێشەکییەکەی گۆران پرسیاری سەرەکی باسەکەمان دێنێتەوە یاد. دیارە گۆران شارەزاییەکی باشی لە بواری ئەدەبی نوێی فارسیدا هەبووە. واتا ئاگاداری ئەو تەوژمە بووە کە لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە بەرەو گۆڕینەوە و نوێکردنەوەی شیعری فارسی ئاراستە

---

(١) سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٧٤.

(٢) هەمان سەرچاوە، هەمان لاپەرە.

بووبوو. بۆیە باس لە ڕۆڵی عشقی لەو بوارەدا دەکات و بە گرنگی هەڵدەسەنگێنێت. هەموو بەڵگەکان بەرەو ئەو ئاراستەیە دەڕۆن کە زۆر ئەستەمە گۆران کە دە ساڵ پاش نیما یوشیج، باوکی شیعری نوێی فارسی، دەستی بە نوێکردنەوەی شیعری کوردی کردووە و ئاگاداری بەرهەمی ئەو شاعیرانە بووە کە هاوچەرخی نیما بوونە و بەرهەمەکەیان لە چاو هی نیما لە ڕووی دەوڵەمەندی و کاریگەری و تازەیی ئاستی هونەرییەوە بەرچاو نین، هیچ ئاگای لە شیعری هاوتا فارسەکەی نەبوبێت. لە گەڵ ئەوەشدا نە شیعرێکی نیمای وەرگێڕاوە و نە ئاماژەشی بە کاریگەریی نیما لە بەرهەمەکەی کردووە. تەنانەت ناوی نیماشی بە شێوەیەک لە شێوەکان نە هێناوە. لە چاوپێکەوتنێکدا لە گەڵ عبدالرزاق بیمار خۆی ئاماژە بەو ڕاستییە دەکات کە لە سەرەتادا لە ژێر کاریگەریی شیعری فارسیشدا بووە:

**پاش ئەم ماوەیە کە سەرمەستی ئەدەبی تورکی و فارسی بووین، بەرەبەرە ئەدەبی تازەی عەرەب و ئەدەبی ئینگلیزی هاتنە کایەوەو بلاو بوونەوە**[1]....

ئێمە هەوڵ دەدەین لەم بەشە و لە بەشی داهاتوودا بە بەراورد لە گەڵ بەرهەمی نیمادا بزانین لە بەر چی نوێکردنەوەی شیعری فارسی لە لای نیما نەبۆتە جێی سەرنجی گۆران، لە کاتێکدا کە خۆی خەریکی نوێکردنەوە بووە و لە میانەی کارەکەیدا پێکۆلی کردووە سوود لە شیعری بیانی بە تایبەتی شیعری نەتەوەکانی دەوروبەر ببینێت.

گۆران خۆی دوو کۆمەڵە شیعری بە ناوەکانی ( بەهەشت و یادگار) و (فرمێسک و هونەر) لە چاپ داوە. بەڵام مەرگ ڕێگەی پێ نادات کە لە چاپ دانی کۆمەڵە شیعری خۆی (سروشت و دەروون) بە چاوی خۆی ببینێت. سەرجەمی بەرهەمی شیعریی گۆران پاش مەرگی لە

(١) بیمار، ع، (١٩٧٠)، ل ٣٠.

لایەن محمدی مەلا کریم ەوە کۆ کراوەتەوە و لە ساڵی **١٩٨٠** دا لە بەغدا لە چاپ دراوە. شایانی باسە کە گۆران پەخشاننوسیشە و ژمارەیەکی بەرچاوی نووسین و وەرگێڕاوە ئەدەبی و ڕامیارییەکانی لە بەرهەمێکدا بە ناوی پە*خشانەکانی گۆران* لە لایەن ئومێد ئاشناوە لە چاپ دراون[١].

(١) بۆ زانیاری زیاتر لە سەر ژیانی گۆران بڕوانە: گۆران، (١٩٨٠)، ل **٥٤٥-٥٤٩**.

# به دوای ناسنامەی نەتەوایەتیی شیعر

## شێواندنی قاڵبە کلاسیکە ناسراوەکان

وەکوو زۆربەی شاعیران، گۆران ژیانی شیعری خۆی بە نووسینی شیعریی کلاسیکەوە دەست پێ دەکات و تیایاندا پێڕەوی یاسا کلاسیکەکانی داڕشتنی شیعریی کوردی دەکات. با بزانین خۆی چۆن لە سەرەتای کۆمەڵە شیعریی (بەهەشت و یادگار)دا تایبەتمەندییەکانی یەکەم تاقیکردنەوەی شیعریمان بۆ باس دەکات:

**بەهەشت و یادگار کۆمەڵە شیعرێکە لە دیوانەکەم سەرانسەر لە گەڵ بابەتەکانی جوانی و دڵداری خەریکە. هەڵبەستی وای تیایە بیست و پێنج ساڵ، بەڵکو زیاتر، لەمەو پێش دانراوە، هەروەکو هیی چەند مانگێک لەمەو بەریشی تیایە. بەشی زۆری کۆنەکان بە وەزنی عەرووض وە کوردیەکی کۆنی تێکەڵاو بە زمانی بێگانە نووسراون. ئوسلووبیشیان کۆنە**[1]..

لە ڕاستیشدا شیعرە سەرەتاییەکانی ڕادەی شارەزایی گۆران لە بواری یاسا کلاسیکەکانی شیعری کوردی دەخەنە ڕوو. بە تایبەتی لە بواری غەزەل (ئەڕۆی ئۆغر، ل**٦٣** ؛ ئەی شەوقی گەلاوێژ، ل**٦٥**)، قیتعە (جەواب بۆ جەناب، ل**١٢٢**؛ ئەی گەلاوێژ، ل**١٧٣**)، چوارپارە (حوزنی پەچە، ل**١٩**؛ ژن، ل**٧٤**)، تەرکیب بەند (مەدەنییەت، ل**٧١**) و تەرجیع بەند (جوانی لادێ، ل**٣٢**) دا. بەڵام وردەوردە سنووری یاسا کۆنەکان دەشکێنێت و هەندێ گۆڕانکاریی کچکە لە بواری قاڵبە شیعرییەکاندا ئەنجام دەدات.

---

(١) گۆران، (١٩٨٠)، ل ٣.

**(دەروێش عەبدوڵلا، ل١٢٠)**

نە حەرفی مەکتەبێکت خوێند، نە ئوستادێ پەلی گرتی،
صیرف بەرزی ذەکا ئەم صنعەتەی فێر کرد بە شمشاڵت،
هەموو وەزنێکی گۆرانی، لە توولانی هەتا کورتی،
بە سەرپەنجەی هونەر کردت بە دیلی کۆششی زاڵت!..
(مەفاعیلون مەفاعیلون مەفاعیلون مەفاعیلون)

ئەمە چوارەمین بەندە لە کۆی حەوت بەندی شیعرەکە کە سەرانسەر بە کێشی هەزەجی هەشت هەنگاوی سالم هۆنراوە. لە بەندی یەکەمەوە تا بەندی پێنجەم هەموویان دو دێڕین. واتە هەر بەندێک لە چوار نیوەدێڕ پێک دێت. لە یەکەم تێڕوانیندا جۆری ڕێزکردنی سەرواکان a b a b و تاکەکێشی عەڕووزیی شیعرەکە، قاڵبی کلاسیکی چوارپارەمان دێنێتەوە بیر[1]. بەڵام دوو بەندی کۆتایی شیعرەکە واتە بەندەکانی شەش و حەوت کە سێ دێڕین و لە ڕاستیدا لەبەر سەروای گرێدراویان یەک بەند پێک دێنن، ڕێگامان پێ نادەن ناوی قاڵبی کلاسیکی چوارپارەی لێ بنێین.

بە هەمان شێوە شیعری (شەوێکی بەهار، ل ١٧١) لە سەر کێشی عەڕووزیی ( مەفعوولو مەفاعییلو مەفاعییلو فەعوولون) هەزەجی

---

(١) چوارپارە (یا خود چارپارە ــ دو بیتیهای پیوستە) تازەترین قاڵبی شیعری کلاسیکی فارسییە. فۆرمە باوەکەی لەوانەیە بۆ یەکەم جار لە لایەن فریدون توللی شاعیری هاوچەرخی ئێران بە کار هاتبێت. وەکوو لە ناوەکەشی دیارە، بریتییە لە شیعرێک کە لە چەند بەندی چواردێڕی پێک دێت و سەروا لە هەموو بەندەکاندا پێڕەوی لەم سیستەمی Ø a Ø a دەکات و بەندەکان لە ڕووی سەرواوە سەربەخۆن. بەڵام هەندێ چوارپارە لە سەرەتای سەدەی بیستەم لە لایەن هەندێ لە شاعیرە فارسەکانەوە بە سەروایەکی جیاواز بە کار هاتوون. وەکوو سیستەمی a b a b یا a b b a بۆ هەر بەندێک. بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە : حقوقی، م، *مروری بر تاریخ ادب و ادبیات امروز ایران ٢*، چاپ چهارم، تهران، نشر قطره، ١٣٨٠/ ٢٠٠١. ص **٤٤٢، ٤٤٨** و **٥٣٤**. لەوە دەچێت گۆران ئەم قاڵبەی لە شیعری فارسیی سەرەتای سەدەی بیستەمەوە ناسیبێت و وەریگرتبێت.

هەشت هەنگاوی ئەخرەبی مەکفووفی مەحزووف هۆنراوەتەوە و لە سێ بەندیدا پێڕەوی سەروای a b a b دەکات، و دیسانەوە لە چوارپارە دەچێت. بەندی دووەمی بەم شێوەیەیە:

تاریکی، تەمی دەشتی دڵ و تانەیی سەرچاو،
شاباڵی پەخش کردبوو تا کو ئەبەدی ییەت..
بێ دەنگی لە چوار لاوە موهاجیم وە خورۆشاو،
وەک ظوڵمەتی شەو نەیبوو ئەویش نووک و نیهایەت!

بەڵام بەندی سێیەم و پێنجەم و شەشەمی شیعرەکە، هەر یەکەو سێ دێڕی هەیە:

جارجار لە ئوفوق ڕائەوەشا شیری برووسکە،
گرمەی غەزەبی گوێی کەڕ ئەکرد هەورە تریشقە؛
باران سەرەتای ڕیققەتی بوو: نم نم ئەگریا،
وەستا بوو زەوی تینوو زەلیلانە لە بەریا!
ئەمجا بە خوڕەم باری، لە پاش یەک دوو دەقیقە،
ئافاقی ئەمەل ڕەش بوو، نەما پێوە تروسکە!...

ئەمە جگە لەوەی بەندی یەکەمیان کە دوو دێڕییە پێڕەوی لە سیستەمێکی تری سەروا یا خود a b b a دەکات. بۆیە ناتوانین ناوی چوارپارە لە سەر ئەم شیعرە دابنێین. ڕاستە گۆران لە یاسا بنەماییە کۆنەکانی ڕوخساری شیعری لانادات، لە گەڵ ئەوەشدا قاڵبی جیاواز لە قاڵبە کلاسیکە ناسراوەکان دێنێتە دی. کەچی بۆ لادان لە کلاسیزم گۆران هەر بەمە ناوەستێت؛ چونکە هێشتا سەنگی یاسا کۆنەکان هەستی پێ دەکرێت. لێرەیە کە نوێکردنەوەی شیعری کوردی دەکەوێتەوە قۆناغێکی تازە.

- **کێشی عەڕووزیی ئازاد**

شێوازی کاری گۆران لەم قۆناغەدا شێوازێکی ڕەنگاوڕەنگە. ئەم جۆراوجۆرییەش لەوانەیە پێوەندیی بە شارەزایی گۆرانەوە هەبێت لە بواری شیعرە نوێیە بیانییەکاندا و ئەو ڕێوشوێنانەی شاعیرانی بیانی لە ئازادکردنی شیعرەکانیاندا گرتوویانەتەوە بەر.

دیوانی گۆران چل شیعری عەڕووزیی کلاسیک دەگرێتەوە خۆی. ئەم شیعرانە بە کێشەکانی هەزەج، موجتەس، ڕەمەڵ، خەفیف، موزارع، ڕەجەز و موتەقارب هۆنراونەتەوە[1] کە دوو نموونەیان لێ دەخەینە ڕوو:

(**لە بەختی تار، ل ٦٩**)

لە بەختی تاری شەو ناکەم شیکایەت،
شەبیهە چونکە بەو زوڵفی سیایەت!
نی یە قابیل بڕینی ڕاهی دووری
وەکوو پرچت کشاوە بێ نیهایەت!
مەفاعییلون مەفاعییلون فەعوولون
مەفاعییلون مەفاعییلون فەعوولون

(**داخی نامق کەمال، ل ٤٥٩**)

فەیلەسووفی ڕۆژهەڵاتی عەصر بووی
ڕاست لە عیلما تۆ فەریدی دەهر بووی.

لەفظی پەخشانت هەموو سیحری حەڵاڵ
نەظمی شیعرت ڕشتەیی یاقووتی ئاڵ.
فاعیلاتون فاعیلاتون فاعیلان
فاعیلاتون فاعیلاتون فاعیلان

---

(١) مەولوود، ع، «چل شیعری عەرووزی گۆران» لە *گۆڤاری ڕامان*، ژ **٥٠**، هەولێر، دەزگای گولان، **٢٠٠٠**، ل **١٥٤–١٥٥**.

لە نموونەی یەکەمدا هەر دێڕێک لە شەش هەنگاوی عەرووزیی سەر بە کێشی هەزەج پێک هاتووە. کێشی شیعرەکە بریتییە لە هەزەجی شەش هەنگاوی مەحزووف و شیعرەکە وەکوو هەر شیعرێکی کلاسیک، کێشی خۆی تا دێڕی کۆتایی لە هەمان شێوەدا دەپارێزێت. لە نموونەی دووەمیشدا شیعرەکە بە هەمان شێوە تا دێڕی کۆتایی بە کێشی ڕەمەڵی شەش هەنگاوی مەحزووف یا مەقسوور هۆنراوەتەوە[1]. واتا قەوارەی هەموو دێڕەکان لە هەردوو شیعرەکەدا یەکسانە. ئەم تایبەتمەندییە لە هەندێ شیعری گۆڕاندا شوێنی نامێنێت و شیعرەکان لەم ڕووەوە ڕەنگێکی ئازاد دەگرنەوە خۆیان[2].

(**ئاخ هەزار ئاخ، ل١٨٥**)

ئەی ئەوەی قەومانی بەش بەش کرد بە پێی خاک و زمان،
فاعیلاتون فاعیلاتون فاعیلاتون فاعیلان
دای بە هەر قەومێ نگین و تاج و تەختی حوڕ ژیان!
فاعیلاتون فاعیلاتون فاعیلاتون فاعیلان
کوا نگینی بەختی من؟
فاعیلاتون فاعیلون
کوانێ تاج و تەختی من؟
فاعیلاتون فاعیلون
بۆ لە خاکی پاک و زار و بێ گرێم،
فاعیلاتون فاعیلاتون فاعیلان
غەدر ئەکەی؟ نابەخشی پێم؟
فاعیلاتون فاعیلان
یا ئیلاهی هەقی خۆم داوا ئەکەم:
فاعیلاتون فاعیلاتون فاعیلون
کوا نگین و تەختەکەم؛
فاعیلاتون فاعیلون

---

(١) لە بەر ئەوەی سەروای شیعرەکە مەسنەوییە، هەنگاوی کۆتایی هەندێ جار مەحزووف و هەندێ جار مەقسوورە.

(٢) بەکر محەمەد، م، (١٩٩٨)، ل ١٢.

جیاوازیی کێشی ئەم شیعرە لە گەڵ شیعرەکانی پێشوودا دیارە. هەر بە تێڕوانینێکی خێراوە یەکەم جیاوازی کە قەوارەی نیوەدێڕەکانە، بەرچاو دەکەوێت. ئەم دیاردەیە لە نموونەی خوارەوەدا بەرچاوترە:

(**بت**، **ل ٤٨٣**)

ـ کێ شکانی سەری بت؟
فاعیلاتون فەعیلون
ـ سەری بت ئێمە شکانمان ئێمە!
فاعیلاتون فەعیلاتون فەع لون
ـ چوار پەلی ئەسپەکەیی کێ پەی کرد؟
فاعیلاتون فەعیلاتون فەع لان
ـ ئێمەیی داس بە دەس بووین، ئێمە!
فاعیلاتون فەعیلاتون فەع لون
ـ ورگی بت کێ بوو دڕی؟
فاعیلاتون فەعیلون
نەدڕاوە سکی بت
فاعیلاتون فەعیلون
نەدڕاوە،
فەعیلاتون
کێ دیی؟
فەع لون
بدڕە ئەی دەستی بە هێزی هاوڕێ:
فاعیلاتون فەعیلاتون فەع لون
ڕێی سبەینێ یی مەزن
فاعیلاتون فەع لون
بدڕە ڕووپۆشی فەساڵی بتی شووم

فاعیلاتون فەعیلاتون فەعیلان
تا ببینین کە لە سەر ناوچاوی
فاعیلاتون فەعیلاتون فەع لون
ناوی کێ نووسراوە؟
فاعیلاتون فەع لان
ناوی ئەو پیاو کوژە وا (ئازەر) و (تیر)
فاعیلاتون فەعیلاتون فەعیلان
خوێنی گەلمانی ڕژان..
فاعیلاتون فەعیلان
.......

لە هەنگاوە عەڕووزییە بەکارهێنراوەکان دیارە کە دێڕەکان بە کێشی ڕەمەڵەوە هۆنراون. بەڵام ئەوەی کێشی ئەم شیعرە لەوەی لە شیعری کلاسیکدا بینیمان، جیا دەکاتەوە ئەوەیە کە هەموو دێڕەکان قەوارەی یەکسانیان نییە. لە شیعری کلاسیکدا یەکسانیی قەوارەی دوو نیوەدێڕی دێڕێک لە لایەک و هی دێڕەکان لە لایەکی ترەوە، واتا یەکسانیی ژمارەی بڕگەکانیان مەرجی یەکەمی کێشی شیعرە. لەم دوو نموونەیەدا شاعیر لەم یاسا بنەڕەتییە لادەدات. لە شیعری (ئاخ هەزار ئاخ) دا بچووکترین دێڕ لە حەوت بڕگە و گەورەترینیان لە پانزدە بڕگە پێک دێت. لە شیعری (بت)یشدا بچووکترین دێڕ لە دوو بڕگە و گەورەترینیان لە یانزە بڕگە پێک دێت[1]. خاڵێکی تر کە کێشی ئەم شیعرە لە کێشی شیعری کلاسیک جیا دەکاتەوە، بریتییە لە هەنگاوە عەڕووزییە بەکارهێنراوەکان. لە شیعری کلاسیکدا ـ وەکوو بینیمان ـ نموونەی هەنگاوی هەموو دێڕێکی شیعری، هەنگاوەکانی دێڕی یەکەمن. واتا ئەگەر دێڕی یەکەمی شیعرێک بە کێشی ڕەمەڵی شەش

(١) لەبەر ئەوەی یەکسانی قەوارەی نیوەدێڕەکان و دێڕەکان لەم شیعرەدا پێڕەو نەکراوە، ئێمە وشەی دێڕ بۆ هەر ڕیزێکی شیعری بە کار دێنین.

هــەنگاوی مــەحزووف بێــت، دەبــێ هــەموو دێــڕەکانی تــر بــەو کێشــە بهۆنرێنەوە. ڕێکخستنی هەنگاوەکانی کێشێکی کلاسیکی عەرووزیش خاوەن پێڕەو و یاسای خۆیەتی. بۆ نموونە هەنگاوی (مەفعوولو) لە دەریای هەزەجدا تەنیا لە سەرەتای نیوەدێڕەکاندا دیار دەبێت. هەندێ لە هەنگاوەکانیش وەکوو (مەحزووف، مەقسوور، موسەببەغ، ئەسڵەم،...) تەنها لە کۆتایی دێڕ و نیوەدێڕدا دێن و دەبن بە «ضــرب». بە واتایەکی تر تەنیا یەکێک لەم هەنگاوانە بۆی هەیە ببێ بە هەنگاوی کۆتایی دێڕ یا نیوەدێڕ. کەچی لە نموونەی یەکەمدا هەندێ جار هەنگاوی (فاعیلان) و هەندێ جاریش هەنگاوی (فاعیلون) کۆتایی بە دێڕی شیعری دێنن. لە شیعری دووەمیشدا جگە لەوەی کە هەنگاوی (فەع لون)ی دێڕی (کێ دی؟) تاکە هەنگاوی دێڕەکەیە و ئەمە لەخۆیدا بێ وێنەیە، هەر چوار هەنگاوی (فەع لون، فەعیلون، فەع لان، فەعیلان) بە جیاجیا لە شیعرەکەدا وەکوو هەنگاوی کۆتایی دێڕ دەبینرێن. هەر بۆیە بە پێچەوانەی شیعری کلاسیک، بۆ ناونانی کێشی ئەم شیعرانە ئێمە ناتوانین سوود لە ناوی هەنگاوەکان ببینین ( بۆ نموونە وەکوو کێشی ڕەمەڵی شەش هەنگاوی مەحزووف کە بە گوێرەی ژمارە و جۆری هەنگاوەکانی دێڕێکەوە ناونراوە)، تەنیا ئەوە نەبێت کە دەتوانین ئەو دەریایە دەستنیشان بکەین کە هەنگاوەکانی لێ وەرگیراون؛ کە لە هەردوو نموونەکەماندا هەنگاوەکان سەر بە دەریای ڕەمەڵن.

بەڵام بۆچی گۆران ئەم گۆڕانکارییە لە کێشی ئەم دوو شیعرەدا ئەنجام دەدات؟ محەمەد بەکر لەو باوەڕەدایە کە سەربەستیی ئەم شیعرانە لەوەدایە کە واتای شیعری بە گوێرەی پێویست ژمارەی هەنگاوەکان لە دێڕی شیعریدا دەستنیشان دەکات[1]. واتا ئەگەر

(١) سەرچاوەی پێشوو، هەمان لاپەڕە.

شاعیر لە شیعری کلاسیکدا واتای شیعری خۆی دەخستە ژێر زەبری یەکێتی کێشی شیعر، ئەوا لێرەدا گۆران کێشی شیعر دەکاتە فەرمانبەری واتای شیعری. ئەمەش بێگومان کاری شاعیر لە گەڕان بە دوای وشەی گونجاو لە گەڵ کێشی شیعرەکەیدا ئاسانتر دەکات. بەڵام ئەوەی سەرنجڕاکێشە ئەوەیە کە لە کۆی شیعرەکانی، گۆران ئەم ئەزموونە تەنیا بە سەر دوو شیعردا تاقی دەکاتەوە کە یەکێکیانی لە فارسییەوە وەرگێڕاوە. دیارە ئەم شێوازەی وەکوو تاکە شێواز بۆ نوێکردنەوەی شیعرەکانی بە دڵ نییە و ڕەنگە بیرۆکەی ئەم شێوازە لە خودی گۆرانەوە نەبێت. بە هەر حاڵ ئەم سەربەستییە لە هۆنینەوەی شیعری عەرووزیدا شوێنێکی بەرچاوی لە شیعری گۆراندا نییە و دیارە گۆران زیاتر لە خودی کێشی عەرووز، بیر لە ناسنامەکەی دەکاتەوە.

## ■ دابڕان لە کێشی بیانی

شۆڕشی ڕاستەقینەی گۆران لە بواری کێشی شیعری کوردیدا بریتییە لە دەرخستنی پڕۆژە نوێگەرییەکەی لە چوارچێوەی کێشی عەرووزی عەرەبی و هۆنینەوەی شیعرەکانی بە کێشی بڕگەیی خۆماڵیی کوردی. ئەم کارەی گۆران بێگومان مانایەکی تایبەت دەگرێتەوە خۆی. هێنانە ناوەوەی کێشە خۆماڵییەکان بۆ ناو شیعری نووسراوی کوردی بەهادانە بە فاکتەرە کولتوورییە نەتەوایەتییەکان بەرانبەر بەو فاکتەرە بیانییانەی شیعری کوردییان بۆ ماوەیەکی دووروودرێژ داگیر کردبوو. ئەمەش بە بە کارهێنانی کێشە بڕگەییەکانی شیعری سەرزارەکیی کوردی کە بریتین لە کێشەکانی دە بڕگەیی (**٥+٥**)، هەشت بڕگەیی (**٤+٤**) و حەوت بڕگەیی (**٤+٣** یا **٣+٤**)[1]. دەکرێ ئەم هەنگاوە بە شکاندنی سنووری نێوان شیعری نووسراو و شیعری سەرزارەکیی خەڵکی دابنێین. لە پێشەکیی

(١) خەزنەدار، م، (**١٩٦٢**)، ل **٣١-٣٤**.

کۆمەڵــە شــیعری بەهەشــت و یادگــار دا گــۆران بــەم ئاوایــە ئــەم دیاردەیەمان بۆ باس دەکات:

**شیعرە تازەکان بە وەزنی پەنجــە (هیجــا) هەڵبەســتراون کــە هەرچــەند شــیعر دۆستەکانی کۆن بە خوێندنەوەی ڕانەهاتوون، بەڵام لە بەر ئەوەی وەزنی تایبــەتیی نەتەوەییمانە وە لە گەڵ خەصائیصی زمانەکەمان چاتر ڕێک دەکەوێ، بــە پێویســتم زانی لە ماوەی تەقەلای ئەدەبی خۆما، ڕۆژبەڕۆژ بەرەو لایەنی بــە کارهێــنانی ئــەم وەزنە بچم، تا لەم چەند ساڵی دواییدا وەزنی عەرووضــم بە تــەواوی، وەلام وایــە بــۆ ئێجگاری بەرەڵڵا کرد، مەگەر پێویستێکی هاندەری تایبەتی ڕووبدا**[1].

لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ عبدالرزاق بیمار، گۆران ئەو ڕاستییەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە خۆی و هاوچەرخەکانی، شێخ نووری و ڕەشید نەجیب هاوکات دەستیان بە نوێکردنەوەی شیعری کوردی کردووە و شیعری هاوچەرخی تورکی ئیلهامدەریان بووە. بەڵام ئەوان گۆڕینی جۆری کێشی شیعری کوردییان پێ مەبەست نەبووە و شیعرەکانیان هەر لە سەر بنەمای کێشی عەرووزی عەرەبی بنیات ناوە. هەروەها پەیدابوونی بیرۆکەی گۆڕینی کێشی شیعری کوردی لە عەرووزییەوە بــۆ برگــەیی خۆمــاڵی لای خــۆی، لــە ئاشــنایەتیی لــە گــەڵ شــیعری هاوچەرخی تورکییەوە سەرچاوە وەردەگرێت:

**ئەگەرچی شعر هەر لە سەر عەرەب هونراوەتەوە لەم ســەردەمەدا، بــەلام مجزوئەکانی بحری عروضیان وەرئەگرت. وە ئەو بحرانەی کە زور بە کار نەئەهینران لە لای شاعیرە کونەکان. بو وینە نالی و سالم و هاوری کانیان زیاتر بحری (هزج) و (رەمل)یان بە کار هینــاوە، بــەلام ئەمانــە لــە بحــری ســریع و خفیــف و لــە هــزج (مجزوئاتیان) وەر ئەگرت وە زیاتری (زواحف) و (علل)یان بە کار ئەهینا.**

**ئەم تازەکردنەوەیە بە (تەقلید) کردنی ئەدەبی تورک روویدا. بەلام ئەدەبی تورکی جوولانەوەی تازەتری لی دەرکەوت کە تورکەکان لە رووی گیــانیکی (قــەومی)یــەوە**

(١) گۆران، (١٩٨٠)، ل ٣.

**ئەهاتن کیشی هەلبەستە شعبی یەکانیان ئەژیانەوە و لە سەر ئەم کیشانە هەلبەستیان دائەنا.. کە ئەمەش کیشی هیجایە.**

**ئیتر من تەنها بە کوششی ئەوان نەوەستام و وەزنی هیجاشم وەرگرت و بە کار هینا**[1]...

گۆران لە موحازەرەکانی خۆیدا لە کۆلیجی ئەدەبیاتی بەغدا کاتێ باس لە ڕێچکە هاوچەرخەکانی کێشی هەڵبەست دەکات، بەم شێوەیە باس لە کاریگەریی شاعیرە تورکەکان دەکات:

**ڕێچکەی دووەم: ڕێچکەی بوێژە تازەکانە و لە سەر بنەڕەتی ژمارەی بڕگە ئەڕوا، لەهەر پێیە درێژەکانی هەڵبەست بەوێنەی کێشی فەرەنسزی، .... هۆی گرنگیی ئەم ڕێچکەیە لە لایەن بوێژە تازەکانەوە بووژانەوەی هەستی نەتەوایەتییە لە ناو گەلانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستا دەستێکی گەورەی تیا هەیە، ... تێکۆشین هەتا بڵێی گەرم بوو بۆ گۆڕینی ئەلفوبێ و، بۆ بژارکردنی زمانی تورکی، بۆ بادانەوە لە هەڵبەستا لە کێش و عەروزەوە بۆ ئەو کێشەی تورکییە گەلانییە، کە عوسمانییەکان خۆیان «کێشی پەنجە یان کێشی هیجا»یان پێ ئەوت، ئەم تەقەلایە گۆڕانێکی سروشتی بوو، کە سەرنجی ڕۆشنبیرەکانی کوردی ناو سنووری دەوڵەتی عوسمانی ڕابکێشێت، ئەمانیش هەر لەو سەردەمەوە وردە وردە کەوتنە بایەخدان بەم باری سەرنجە تازەیە بەرامبەر بە بەرژەوەندی نەتەوایەتی (مەصالحی قەومی) و ژیانی کۆمەڵایەتی بە تایبەتی بوێژەکان لە ماوەی بۆلوانیا بەسووری (گەرمی) دەستیان دایە چاوگێڕان بە شوێن کێشی تایبەتی نەتەوەیی کوردا،**[2]...

ڕاستە شیعری هاوچەرخی تورکی، وەکوو خودی گۆران ئاماژەی بۆ دەکات، ئیلهامدەری بووە لە هەوڵە تازەکەیدا لە گۆڕینی کێشی عەرووزی بە کێشی بڕگەیی. بەڵام لە پێشەکیی کۆمەڵە شیعری بەهەشت و یادگار دا وا پیشان دەدات کە چاولێکردنی لە شیعری تورکی، چاولێکردنێکی کوێرانە نەبووە و ئەگەر کێشی بڕگەیی پێ

(١) بیمار، ع، (**١٩٧٠**)، ل **٣**.

(٢) ئاشنا، ئ، (**٢٠٠٢**)، ل **١٥٧** و **١٥٨**.

باشتر بووه، له بەر ئەوە بووە کە باشتر لەگەڵ تایبەتمەندییەکانی زمانی کوردیدا دەگونجێت. گۆڕانکارییەکانی شیعری هاوچەرخی تورکی وایان کرد کە شاعیرانی کورد، بەتایبەتی گۆران، لە دەرگای شیعری فۆلکلۆریی کوردی و شیعری کلاسیکی گۆرانی، کە بە کێشی خۆماڵیی کوردی هۆنراوەتەوە، بدەن. گۆران لە بەردەوامیی وتەکانیدا لەبارەی شاعیرە کوردەکانەوە دەڵێت:

... **ئەمانە بۆ گەیشتنی زوو بە ئامانج لەلایەکەوە فۆلکلۆرە ڕەنگینەکەی گەلی کورد بە گشتی لەلایەکی ترەوە کێشەی دە بڕگەییەکەی هەڵبەستی گۆرانی «شێوەی زمانی گۆران» بە هونەرە بەرزە جوانەکەی (مەولەوی)یەوە ڕێگای ئارەقڕشتنی بۆ ئاسان کردن،**[1]...

لە ژمارە **٣١**ی گۆڤاری هیوای ساڵی **١٩٦١** یشدا دەڵێت:

**هەڵبەستی تازەی کوردی، بە زۆری چووەتەوە سەر کێش (وەزن)ە نەتەوەییەکەی حونجە _ پەنجە (هیجا _ مقطع) لە کاتێکا کێشی هەڵبەستی کۆن (عروض) بوو، کە ئێستاش هێشتا لایەنگری لە ناو بوێژەکان ماوە، کە ئەمانە لە سەرێکەوە کەمایەتیین لە سەرێکیشەوە نوێنەری ڕێژگەیەکی کۆنن، جگە لەمە بوێژی بەناوبانگ مەولەوی و بوێژەکانی تری شێوەی گۆرانی (هەورامی)یش بە عەرووز نا بە کێشێکی دە حونجە (هیجا)یی هەڵبەستیان داناوە**[2].

کەواتە جگە لە شیعری فۆلکلۆریی کوردی، شیعری کلاسیکی شێوەی گۆرانی بە هۆی کێشە خۆماڵییەکەیەوە جێی بایەخی گۆران بووە. ئەو کێشانەی گۆران لە شیعری شێوەی گۆران یان لە شیعری خۆماڵییەوە وەردەگرێت بریتین لە:

**_ کێشی یانزە بڕگەیی (٤+٤+٣)**

کەی تۆم دیوە؟ / کەی ئەت ناسم؟ / کەی؟کەی؟کەی؟
دڵداری چی؟ / پەیمانی چی؟ / حەی!حەی!حەی!
وەک سیحرباز/ هاتووی بەندی/ دەلەسە (**هەڵبەستی ڕەنجاو، ل ٣٧**)
ئەخەیتە پێم، / دیلم ئەکەی، / نا بەسە!

(١) سەرچاوەی پێشوو، ل **١٥٨**.
(٢) هەمان سەرچاوە، ل **٢٨**.

ـ **کێشی دە بڕگەیی (٥+٥)**

ڕۆڵەی تاقانەم، / هیوای ژیانم،
ئەستێرە گەشەی / بەری بەیانم،
ڕۆژی نەورۆزی / پرشنگ زێڕینم، **(لە سەر مەرگی هیوا، ل ٩٣)**
تریفەی سپی / مانگی هاوینم،

ـ **کێشی هەشت بڕگەیی (٤+٤)**

کفرە لای من / لە یار ڕەنجان
پێی لێ ئەنێم / ئەی زوهرەی جوان!
هەرزە گۆییم / کرد هەر چیم وت، **(هەڵبەستی پەشیمان، ل ٣٩)**
وا ئەو چڵکەم / بە فرمێسک شت،

ـ **کێشی حەوت بڕگەیی (٤+٣ یان ٣+٤)**

ئەی باڵداری / ئێسک سووک،
بلبلی / دەنووک بچووک،
باغچە بە / باغچە ئەفڕی؛ **(بۆ بلبل، ل ١٠٣)**
وچانێکی / لێ ئەگری:

خودی گۆران لەبارەی ئەم کێشانەوە دەڵێت:

**لە پێشەوە وتمان لە فۆلکلۆری کوردیا کێشی (١٠) بڕگەییە (٥+٥) و، وێنەمان لە هەڵبەستەکانی مەولەوی هێنایەوە، لە پاش کێشی دەیی لە فۆلکلۆردا کێشی هەشتی (٤+٤) دێت، دوای ئەویش کێشی حەوتی (٤+٣) لە تاکەتاکەی دێرەکانی هەڵبەستی لاوک و حەیرانیشا ئەتوانین کێشی یانزە بڕگەیی (٦+٥) و (٤+٤+٣) بدۆزینەوە**[١]...

## ■ داهێنانی کێشی بڕگەیی نوێ

گـۆران لە بەردەوامی قسەکانیدا لە بارەی کێشە بڕگەییەکانی سەرەوە دەڵێت:

**بوێژە تازەکانمان لە ماوەی ئەم دە ساڵانەی دواییدا لە بەرهەمی هونەریانا ئەم جۆرە کێشانەیان هەموو ژیاندۆتەوە، جگە لەوەش چی بە چاولێکەری بێگانە و شتی ڕێگای داهێنانەوە چەند جۆرێکی تازەی کێشیان دۆزیوەتەوە**[٢]...

---

(١) سەرچاوەی پێشوو، ل ١٦٣.

(٢) هەمان سەرچاوە، هەمان لاپەڕە.

كه واته وەرگرتنی كێشی بڕگەیی لە شیعری خۆماڵیی كوردییەوە تاكە مەبەستی گۆران نییە. چونكە داهێنانی شاعیر دەبێ جێپەنجەی خۆی لە سەر كێشی شیعریشدا هەبێت و ئەم ئامانجە تا ئێستا لە شیعری گۆراندا لە بواری كێشی بڕگەییدا نەهاتۆتە كایەوە. ئەم كێشە سەرەتاییانە بۆ شاعیر وەكوو كەرەستەی سەرەكی و خاون بۆ بەرهەمهێنانی كەرەستەی تازەی شیعری كە لە قووڵایی بەهرە و هونەری شاعیرەوە سەرچاوە وەردەگرن[1]. بە چاوخشاندنێكی تر بە سەر جۆری كێشە بڕگەییە بەكارهێنراوەكان دەتوانین بچووكترین یەكە پێكهێنەرەكانیان لە ڕووی كێشەوە دەستنیشان بكەین كە بریتین لە یەكە سیلابییەكانی **٣**، **٤** و **٥** بڕگەیی. ئەم یەكانە كە بە ژمارەی بڕگەكانیانەوە دەستنیشانكراون، كەرەستەی بنەڕەتیی كێشی بڕگەیین و گۆران هەر لەو یەكانە بۆ بنیاتنانی كێشی بڕگەیی تازە سوود وەردەگرێت.

**ـ كێشی دوانزە بڕگەیی (٣+٣+٣+٣)**

قژ كاڵی، / لێو ئاڵی / پرشنگی / نیگا كاڵ،
ئەی كچە / جوانەكەی / سەرگۆنا / نەختێك ئاڵ!
ئەی كچە / مەنگەنەی / بە دەنگی / چپە دوو، (**جوانی بێ ناو، ل ٤٥**)
گەندەمووی / دەم و چاو، / مەچەك هەڵ / نەگرتوو..

**ـ كێشی سیانزە بڕگەیی (٤+٤+٥)**

سەردەمێك بوو / دنیای گیانم / تاریك و چۆڵ بوو؛
كام (بەڕۆچكە)ی / گەرمە دڵم / چەشنی سەهۆڵ بوو؛
قەریحەم وشك، / تەبیعەتم / زەرد و ژاكاو بوو (**نیاز...، ل ٤٢**)
زەردەخەنەم / ئاخی سەرلێو، / فرمێسكی چاو بوو!

---

(**١**) شانوف، ح، *شعر الشاعر الكردي المعاصر عبدالله گوران*، ترجمة مصطفي، ش، بغداد، المثقف الجديد، ١٩٧٥، ص ١٧٦–١٧٧؛ بێكەس، ش، «چەند سەرنجدانێك لە گۆرانی لووتكە» لە *ڕۆشنبیری نوێ*، ژ **٦٤**، بەغدا، دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوكردنەوەی كوردی، **١٩٧٨**، ل **٥٨–٦٨**.

گۆران لە موحازەرەکانیدا لە بارەی کێشە بڕگەییە باوەکانی شیعری کوردی دەدوێت. کاتێ باس لە کێشی دە بڕگەیی (**٥+٥**) دەکات، بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ئاماژە بەوە دەکات کە دەکرێت لە سەر بنەمای کێشێکی ڕەسەن، کێشێکی نوێ دابنرێت:

**کێشی دە بڕگەیی، ئەم کێشە لە هەڵبەستی کوردیدا ئەوەندە باوە پیاو زۆر بە ئاسانی ئەتوانێ ناوی لێ بنێ کێشی نەتەوەیی گەلی کورد... لە ناو هەموو کۆڕەکانی ژن و پیاوا کێشی هەڵبەست نییە ئەوەندەی ئەم کێشی (دەیییە) بە سەر دەمەوە بێ و لە هەڵبەستەکانی چیرۆک و گۆرانی و شیوەن و بەستە و لایەلایەی کوردیدا بەزۆری بە کاردێن و بۆ دانەرەکان بە ئاسانی ڕێک بخرێت، وەتێرە هەڵبەستەکانی کێشی دەیی بە ئاسانی «عادەتی» هەریەکێ لە دوو پێی پێنج بڕگەیی دروست ئەبن؛ بەڵام دروستیشە دێری هەڵبەستی لە سێ پێنج بڕگەیی بهۆنرێتەوە**[1]...

**ـ کێشی پانزە بڕگەیی** (**٥+٥+٥**)

ئەم لا یەک پەڵە، /ئەو لا یەک پەڵە: / هەوری ڕەنگاورەنگ؛
لە ناوەڕاستا:/ بە دەم ئاسوودە / ڕۆژی شۆخ و شەنگ!
سەوزە گیا پاراو، / گوڵ و گوڵاڵە / مەستی ڕەنگ و بۆ، (**دیمەنێکی بەهار، ١٦٩**)
درەخت تازە شین، / سەر لق ڕازاوەی / گوڵ، گەڵا، چرۆ ...

تازەیی ئەم کێشانە لە ژمارەی یەکەکان و جۆری ڕیزکردنەوەیاندایە. ئەم کێشانە بە پێچەوانەی کێشە بڕگەییەکانی پێشوو کە زیاتر دوو یەکەیی بوون، لە سێ یان چوار یەکەی بنەکی پێک دێن. هەروەها جۆری تازەی یەکگرتنەوەی یەکەکانیش تیایاندا دیارە. یەکەی پێنج بڕگەیی کە تەنیا لەگەڵ جۆری پێنج بڕگەییدا یەکی دەگرتەوە، ئەمجارە لە گەڵ یەکەی چوار بڕگەییشدا کێش پێک دێنێت. یەکەی سێ بڕگەییش سەرەڕای یەکگرتنی لە گەڵ یەکەی چوار بڕگەیی،

---

(١) ئاشنا، ء، (٢٠٠٢)، ل ١٦٣.

هەر بە تەنیا بە چوار جار دووبارە بوونەوە کێشێکی نوێ پێک دێنێت. ئەوەی سەرنجڕاکێشە ئەوەیە کە ژمارەیەکی زۆر لەو شیعرانەی بەم کێشانە هۆنراون، یاسای کلاسیکی یەکێتی کێشیان تێیدا بەدی دەکرێت. واتا شاعیر هەموو دێڕەکانی شیعرەکە لە سەرەتاوە تا کۆتایی بە یەک ئەندازە دەکێشێت. بەڵام لەوەش ئاگادارە کە هێشتا بوار ماوە گۆڕانکاریی تر لە چۆنیەتی بە کارهێنانی کێشی خۆماڵیدا ئەنجام بدات.

## ▪ کێشی بڕگەیی ئازاد

لە سەرەتای باسەکەماندا لە سەر کێش بینیمان کە گۆران سوارچاکی هونەری شیعری کلاسیک بوو و هەروەکوو شاعیرە کۆنەکان یاسا کۆنەکانی هۆنینەوەی شیعری پێڕەو دەکرد. بەڵام دواتر لە یاسای یەکێتیی کێش لای دا و شیعرەکانی ـ هەرچەند بە ژمارەیەکی کەم ـ لەم کۆسپە ئازاد کرد. ئێمەش ئەو شیعرانەمان بە عەرووزیی ئازاد ناو برد. گۆران لە گەڵ بە کارهێنانی کێشی بڕگەیی دووبارە ئەو کۆسپەی هێنایەوە ناو شیعر و لە زۆربەی شیعرە بڕگەییەکانیدا یاسای یەکێتیی کێشی شیعری پێڕەو کردەوە. لەگەڵ ئەوەشدا ژمارەیەکی کەم لە شیعرەکانی شایەتی لەو ڕاستییە دەدەن کە ئەم بابەتە لە بواری شیعری بڕگەییشدا مێشکی شاعیری بە خۆیەوە خەریک کردووە. لەم شیعرانەشدا شاعیر دیسان لە یاسای یەکێتیی کێش لادەدات و بەرهەمی ئەم لادانەش لە دوو نموونەی خوارەوەدا دەردەکەوێت:

(گۆرانی لاوانی جیهان، ل**٤٥٣**)

یەکمان ئەخا / یەک هیوا، (**٤+٣**)

لەم پەڕ هەتا / ئەو پەڕی دنیا .. (**٤+٥**)

ڕێمان پێ / بگرێ دوژمن، (**٣+٤**)

بێ گومان سەر / ئەدا لە ئاسن! (**٤+٥**)
لاوان گەر دەنگ / هەڵبڕن، (**٤+٣**)
گەلان گشت / ڕائەپەڕن .. (**٣+٤**)
گۆرانی لاوان، (**٥**)
پڕئەکا ژیان، (**٥**)
لە شادی / بۆ هەموو .. (**٣+٣**)
**[...]**

وەکوو دیارە دێڕەکانی ئەم شیعرە بڕگەییە بە پێچەوانەی شیعرە بڕگەییەکانی پێشوو ئیتر یەک قەوارە یا هەمان ژمارە بڕگەیان نییە. بەڵکوو بە ژمارەی جیاوازی بڕگە هۆنراون. دیاردەیەکی تری تازەش لەم شیعرەدا ئەوەیە کە یەکە بڕگەییەکان کە پێشتر پێکەوە یەک دێڕیان دروست دەکرد، ئەمجارە بە تەنیا دێڕی شیعری پێک دێنن. ئەمە لە دێڕەکانی حەوت و هەشتی ئەم نموونەیە کە تەنیا بەشێکی شیعرەکەیە، بە دیار دەکەوێت. گۆران لە نموونەیەکی تردا دیاردەی تازەی تریشمان دەخاتە بەر دەست:

(یار، ل **٢٠٤**)
یار... یار! (**٢**)
شیرین لەنجەو لار! (**٥**)
چاوم ڕوا.. (**٣**)
صەبرم سوا.. (**٣**)
هێزم لێ بڕا.. (**٥**)
هەر نەهاتی، / دەرنەکەوتی.. (**٤+٤**)
بۆچی تو خوا؟ (**٤**)
یار..یار..شیرین لەنجەو لار! (**٢+٥**)
**[...]**

جیاوازیی ژمارەی بڕگەی دێڕەکان واتا جیاوازیی ئەندازەیان لەم شیعرەدا دیارە. بێجگە لەوە دەتوانین لەم شیعرەدا ئاماژە بە دوو

دیاردەی تازەتر بکەین؛ یەکەمیان بە کارهێنانی یەکەی دوو بڕگەییە کە لە دێڕی یەکەم و دێڕی هەشتەمدا، جارێک سەربەخۆ و جارێکیش لە گەڵ یەکەی پێنج بڕگەییدا بە کار هاتووە و ئەمە لە نموونەی پێشوودا نەدەبینرا. کە چی پێشتر ـ وەکوو بینیمان ـ تەنیا یەکەکانی **٣**، **٤** و **٥** بڕگەیی مافی بەشدارییان لە کێشی شیعری بڕگەییدا هەبوو. دووەم دیاردەی تازە هەر وەکوو نموونەی پێشوو تەنها بەکارهێنانی هەندێ لە یەکەکانە. ئەمەش لە دێڕەکانی یەکەم تا پێنجەم و حەوتەمدا دیارە. شایانی باسە کە خودی گۆران لەبارەی هۆکاری ئازادکردنی شیعری عەرووزی یان بڕگەییەوە زانیاریی ئەوتۆمان ناداتەوە دەست و بۆمان ڕوون ناکاتەوە کە لەم شیعرانەدا چ فاکتەرێک بڕیار لە سەر کورتی و درێژیی دێڕەکان دەدات. دیارە پێوەری سەرەکی لێرەشدا ـ وەکوو بۆچوونی محەمەد بەکر لەبارەی کێشی عەرووزی ئازاد[1] ـ مانایە. لە شیعری کلاسیکدا کە یەکێتیی کێش پارێزراوە، هەندێ جار مانای شیعری قوربانی ئەم لایەنە تەکنیکییە دەبێتەوە. واتا ئەندازەی سنووورداری دێڕەکە وامان لێ دەکات کە لە بەکارهێنانی وشەیەک چاوپۆشین کە سەرەرای جوانی و بەخۆگرتنی تەواوی واتای ویستراو، لە گەڵ جۆر یا ئەندازەی کێشی شیعرەکەدا ناگونجێت. هەندێ جاریش مانای مەبەست لە ناوەڕاستی یەکە شیعرییەکەدا (دێڕ یا نیوەدێڕ) تەواو دەبێت کە چی هێشتا قەبارەی یەکەکە لە ڕووی کێشەوە تەواو نەبووە و شاعیر ناچارە بە وشەی زیادە تەواوی بکات. بەڵام لە جۆری کێشی ئازاددا ئەم ئاستەنگە نامێنێت. لە ئەنجامدا

---

(١) بڕوانە ل ١٠٢.

قەبارەی هەر دێڕێک بە گوێرەی مانای مەبەست و وشە یان وشەگەلی بە کارهێنراو بۆ ئەو مانایە کورت و درێژ دەبێتەوە.

- **کێشی تێکەڵاو**

دوا دیاردەی کێشی شیعری لای گۆران کە شایانی ئاوڕدانەوە بێت، تێکەڵکردنی هەردوو کێشی عەڕووزی و بڕگەییە لە تاکە شیعرێکدا[1]. بۆ یەکەمجار ئەم شیعرە لە ساڵی **١٩٣٢** لە ڕۆژنامەی هاوار بڵاو دەبێتەوە و شاعیر هەر لەوێ لە بارەیەوە دەڵێت:

**ئەم شیعرانە لە سەر ئوصولی(فقرە) ڕێک خراون، هەر فەقەرەیەک عیبارەتە لە چوار بەیت، بەیتی یەکەم و چوارەم لە سەر وەزنی عەروز وتراون، دووەم و سێ یەمیش لە سەر وەزنی پەنجە**[2].

مەبەستی گۆران لە (فقرە) بەندە و وەکوو خۆیشی باسی دەکات، هەر بەندێک لە چوار بەیت (دوو نیوە دێڕ) پێک دێت کە دوو بە دوو عەڕووزی و بڕگەیین. ئێمەش تەنیا یەک بەندی لێ دەخەینە ڕوو. (**ئاواتی دووری، ل ١٣**)

ئـــەی چـــاو! چەشـــنی بـــازی قەفـــەس هـــەڵوەری پـــەڕت،
(مەفعوولو فاعیلاتو مەفاعیلو فاعیلون)
کـــــوا باڵــــە تیـــــژەکانی نیگـــــای حوســـــنی دلبـــــەرت؟
(مەفعوولو فاعیلاتو مەفاعیلو فاعیلون)
کوانێ دوو چا / وی مەست؟ کوانێ؟ (**٤ + ٤**)
کوانێ برۆی پەیوەست؟ کوانێ؟ (**٤ + ٤**)
کوانێ زوڵفی ڕەش؟ (**٥**)
کوڵمی ئاڵ و گەش؟ (**٥**)

---

(١) بەکر محەمەد، م، (١٩٩٨)، ل ١١ ؛ عەلی، د، (١٩٩٨)، ل ١٤٦-١٤٧.
(٢) هەمان سەرچاوە.

کوا هەیکەلی جەمال؟ (مەفعوولو فاعیلان)

کوا حوسنی بێ میثال؟ (مەفعوولو فاعیلان)

دیارە ئەم شیعرە تازەیی زیاتر لەوەی پێشتر بینیمان ناداتەوە دەست. دێڕەکان هەموویان هاوئەندازە نین. بەڵام لە ئاستی دێڕەکاندا نیوەدێڕەکان یەک قەبارەیان هەیە و یەکێتیی کێش لە نێوان خۆیاندا دەپارێزن. هەنگاوە عەرووزییە بە کارهێنراوەکان لە کێشی موزارع وەرگیراون. یەکە ٥ بڕگەییەکانیش ـ وەکوو پێشتریش بینیمان ـ بە تەنیا بە کار هاتوون. بەڵام هۆی هۆنینەوەی ئەم شیعرە لای گۆران چی بووە؟ بۆچی تەنیا یەک نموونە لەم جۆرە لە کۆمەڵە شیعرەکەیدا دەبینرێت؟ ئایا تەنیا تاکە تاقی کردنەوەیەکی کێشی شیعری بووە، بە بێ ئەوەی ببێتە جێی ڕەزامەندی شاعیر، یان وەکوو محەمەد بەکر بۆی چووە ئەم شیعرە قۆناغی گواستنەوەی کێش بووە لە سیستەمی عەرووزییەوە بۆ سیستەمی بڕگەیی[1]؟ هەر چۆنێک بێت، نەبوونی شیعری تری لەم جۆرە لای شاعیر دەشێ نیشانەی ئەوە بێت کە تێکەڵکردنی کێشە جیاوازەکانی (عەرووزی و بڕگەیی) زۆر بە لاوە پەسەند نەبووە.

وا نەبێت کە کێش تەنیا بواری داهێنانی ڕوخساری شیعری لای گۆران بێت. بەڵکوو داهێنانەکانی لە هەمان کاتدا لە بوارەکانی تریشدا پەرە دەستێنن.

(١) بەکر محەمەد، م، (١٩٩٨)، ل ١١.

## ســـەروا

### ▪ دەستکاریی سیستەمی کلاسیک

لـە سـەرەتای ئـەم بەشـەدا باسمـان لـەوە کـرد کـە شـیعری کلاسـیکی فارسـی بـۆ شـاعیرە کوردەکـان سەرچـاوەیەکی سـەرەکیی فێـربوونی هونەری شیعر و تەکنیکەکانی بوو. سەرواش کە وەکـوو کێـش بەشێکە لـەم هونـەرە، لـەو دیاردەیـە خـۆی پـێ نادزرێـتەوە. تـەنیا لـە شـیعری شاعیرانی زاراوەی کوردیی گۆرانی نەبێت کـە سـەرواکەیان ـ کـە هـەر لە شێوەی سەروای مەسنەوی یە ـ لاسایی شیعری فۆلکلـۆریی کـوردیی ناوچـەی خۆیـان دەکـات. یاسـای یەکێـتیی سـەروا و هەنـدێ جـاریش یەکێـتیی سـەروا و ڕەدیـف وەکـوو یاسـای یەکێـتیی کێـش لـە شـیعری کلاسیکی کوردیدا بە وردی پێڕەو کراوە. پێڕەوکردنی ئەم یەکێتییە لـە شـیعرە کلاسـیکەکانی گۆرانـدا لـەم نموونانـەی خـوارەوەدا بۆمـان دەردەکەوێت:

(**ئەی شەوقی گەلاوێژ، ل ٦٥**)

وەک بلبلەکەی فەجری ئەزەل ویردمە ئەی یار:
بۆ ئەو گوڵە وا خەڵقی ئەکا حەمدی ئیلاهت!
بێ عەشقی هەوای پایزە بۆ قەلبی فسردەم،
ئەی ڕۆژی بەهار مەرحەمەتی تینی پەناهت

**اهــت** کـە لـە دوا وشـەی کۆتـایی هەریـەک لـەم دوو دێـڕە (ئیلاهـت، پـەناهت) دا دەبینرێـت و لـە کۆتـایی هــەموو دێـڕەکانی شـیعرەکەدا دووبـارە دەبێـتەوە، سـەروای شـیعرەکە پێـک دێنێـت. هەنـدێ جـار ڕەدیف هاوڕێتیی سەروای شیعری کلاسیکی گۆران دەکات:

(**ئەڕۆی ئۆغر، ل ٦٣**)

بە دوو تا ئەشکی حەسرەت خوێن ئەبارێنێ بە سەر دەشتا،

تەماشای لالەزاری ڕاگوزەر ناکەی ئەڕۆی ئۆغر؟
لە لای خەڵقی گەدایە گەردی ژێر پێی موڵکی دڵداری
بە سایەت وەک (هوما) تاجم لە سەر ناکەی ئەڕۆی ئۆغر؟

لەم دو دێڕەشدا کە دیسان لە غەزەلێکی گۆران وەرگیراون، **ەر** لە کۆتایی دێڕەکاندا سەروا و وشەگەلی **ناکەی ئەڕۆی ئۆغر** ڕەدیفی دێڕەکانە و هاوشانی سەروا لە کۆتایی هەموو دێڕەکانی شیعرەکەدا دووبارە دەبێتەوە. بەڵام هەر لە شیعرە کلاسیکەکانییەوە جۆرە خۆلادانێک لە یەکێتی سەروا و ڕەدیف بەرچاو دەکەوێت. شیعری (حوزنی پەچە، ل **١٩**) لە شەش بەند پێک هاتووە و هەموو بەندەکانی بە کێشی (موفاعیلون فەعیلاتون موفاعیلون فەعیلون) واتا موجتەسسی هەشت هەنگاوی مەخبوونی مەحزووف هۆنراون. یەکێتیی کێشی شیعرەکە و ژمارەی دێڕی بەندەکان لەگەڵ دوو قاڵبی کلاسیکی چارپارە یان موسوممەتدا دەگونجن. کە چی جۆراوجۆریی ڕێزبوونی سەرواکان لە بەندەکاندا ڕێگامان پێ نادات بە هیچ یەک لەو دوو قاڵبە ناوی لێ ببەین. جۆری ڕێزبوونی سەروا لە بەندی یەکەمدا:

ژنێکی شۆخ بە چاوی بەڵەک بە مەئیووسی **a**
خلی ئەکردەوە هۆن هۆن دڵۆپی مرواری؛ **b**
بە ئاو ئەبوو دڵی بەردین لە ئاهـ و ئەفسووسی، **a**
بە ئاوی ساردی پەتی نا، بە مایعی ناری! **b**

بریتییە لە a b a b کە لەگەڵ سەروای چارپارە دا دەگونجێت. کەچی سەروای دوو بەندی کۆتایی

منیش ئەگەر چی بە جیلوە، بە جاذیبەی جوانی **a**
گەلێ لە فەوقی گوڵام و گرانترم لە گوهەر، **b**
وەلێ لە بەر ئەوە هەیهات ئەسیر و زیندانیم **c**
مەداری فەخر و سروورم بووە بە قوطبی کەدەر! **b**

بەڵێ ! هەتاکو جەمالی پتر بێ دیلی پەری **a**
دیارە مەیلی ظوهووری زیاترە، ئەگری: **a**
ئەکا لە ثیقلەتی بەندی ژیانی خۆی نەفرەت! **b**
ئەکا لە پیاوو لە جەهل و تەعەصوبی لەعنەت! ... **b**

پێڕەوی لە دوو سیستەمی جیاوازی a b c b و a a b b دەکات. واتا سەروای نیوەدێڕەکانی یەکەم و سێیەم و نیوەدێڕەکانی دووەم وچوارەم لە هەموو بەندەکاندا یەک نییە. دیارە ئەم سەرواسازییە پێڕەوی لە هیچ سیستەمێکی کلاسیکی پێشوەخت دیاریکراو ناکات. هەرچەندە شاعیر هۆی ئەم لادانەمان بۆ باس ناکات، بەڵام دیارە تەنیا ویستی شاعیر و پێویستیی مانای شیعرەکەن کە بڕیار لە چۆنیەتیی ڕێز بوونی سەرواکان دەدەن.

## ▪ سەروای شیعری فۆلکلۆریی کوردی یان سەروای مەسنەوی؟

یەکێ لە دیارترین جۆرەکانی سەروا لە شیعری گۆراندا سەروای سەربەخۆی دێڕە کە تەنیا لە ئاستی دێڕ و لە کۆتایی هەردوو نیوە دێڕەکەیدا دەردەکەوێت و بە یەکەوە گرێیان دەدات. ئەم سەروایە لە شیعری کلاسیکدا فراوانە و بە سەروای مەسنەوی ناسراوە و وەکوو لە ناوەکەی دیارە، تایبەتە بە قاڵبی کلاسیکی مەسنەوی. خودی گۆران لە بارەیەوە دەڵێت:

**هەڵبەستی کۆن دووایی هەموو بەیتەکانی بەدرێژەکشانی قەسیدە یان غەزەل لە سەر یەک قافیە ئەڕوا، بەڵام یەک قافیە لە هەڵبەستی تازەدا دێرەکان زۆرتر دوو دوو ئەبەستێ پێکەوە، لای ئەوپەڕی لە قافیەبەندی دێرەکانی یەک بەند زیاترتێناپەڕێ**[1].

لێرەدا پرسیار ئەوەیە کە ئایا بە کارهێنانی ئەم سەروایە ئەنجامی لاسایی کردنەوەی سەروای مەسنەویی کلاسیکە، یان هی شیعری فۆلکلۆریی کوردی؟ چونکە ئەم سەروایە یەکێ لە سەروا باوەکانی

(١) ئاشنا، ع، (٢٠٠٢)، ل ٢٨.

شیعری فۆلکلۆریی کوردییە و شیعری نووسراوی کوردیی شێوەزاری گۆرانیش هەمان سەروای وەرگرتووە. ئەگەر گۆران ئەم سەروایەی لە شیعری کلاسیکەوە وەرگرتبایە، لەو کاتەدا دەکرا سەرواکە تەنیا لە مەسنەوییەکانیدا دیار بێت. بەڵام گۆران تەنانەت غەزەلیشی بەو سەروایە ئاراستووە. جگە لەمەش کاتێ گۆران لە موحازەرەکانیدا باسی کێشە باوەکانی شیعری فۆلکلۆری کوردی واتە کێشە دە، هەشت و حەوت بڕگەییەکان دەکات، بۆ هەر یەکێکیان نموونەیەکی شیعری دێنێت و شیعرەکان لەوە دەچن هی خۆی بن. ئەوەی سەرنجڕاکێشە ئەوەیە کە هەموو ئەم شیعرانە سەروای خۆماڵییان هەیە[1].

بۆیە ئێمە پێمان وایە شیعری فۆلکلۆریی کوردی بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ و لەڕێگای شیعری کلاسیکی کوردیی شێوەزاری گۆرانیشەوە لە بەکارهێنانی ئەم سەروایەدا ئیلهامدەری گۆران بووبێت. ئەم سەروایە لەهەر چوار جۆری شیعرەکانیدا بە دیاردەکەوێت.

- **شیعر بە کێشی عەرووزی**

ئەمانە ئەو شیعرانەن کە سەرەڕای قاڵب و کێشی کلاسیکیان وەکوو غەزەل یان قەسیدە بە سەروای خۆماڵی هۆنراون. وەکوو غەزەلی (لە لادێ، ل ٦٠) کە بە کێشی (موفاعیلون فەعیلاتون موفاعیلون فەعلون) واتا موجتەسسی هەشت هەنگاوی مەخبوونی ئەسڵەم هۆنراوەتەوە و یەکێتیی کێش تێیدا بە تەواوی پێڕەو کراوە و بابەتی شیعرەکەش دڵدارییە و لە حەوت دێڕ پێک دێت. ئێمە دوو دێڕی لێ دەخەینە ڕوو:

کراس کەتانی، کەوا سەوزی، بەژن و باڵا بەرز، **a**
بە شان و گۆزەوە چەن جوانی ئەی پەریی سەر ئەرز! **a**

---

(١) سەرچاوەی پێشوو، ل **١٦٣-١٦٤**.

لە دوورەوە چ نمایانە پێچ و سەرپۆشت، **b**
چ زوو ئەگاتە دەماخم شەپۆڵی بۆی خۆشت! **b**
**[...]**

- **شیعر بە کێشی بڕگەیی**

ژمارەیەکی زۆری ئەو شیعرانەی کە بە کێشی بڕگەیی هۆنراون، سەروای خۆماڵییان هەیە. ژمارەی دێڕەکانیان جۆراوجۆرە و لە نێوان ٧ تا **٢٥** دێڕ لە گۆڕاندایە. (هەڵبەستی دەروون، ل**١٢١**) یەکێکە لەو شیعرانە:

هەر چەن ئەکەم، / ئەو خەیاڵەی / پێی مەستم، **a**
بۆم ناخرێتە / نێو چوارچێوەی / هەڵبەستم! **a**

لێک دانەوەی / دەروون، قسەی /زمانم: **b**
بۆ چی وەها / دوورن لە یەک؟ / نازانم! **b**
**[...]**

- **شیعر بە کێشی تێکەڵاو**

مەبەستمان شیعری (ئاواتی دووری، ل **١٣**) یە کە بە هەردوو کێشی عەرووزی و بڕگەیی هۆنراوەتەوە و هەمدیسان سەروای خۆماڵی بە سەر شیعرەکەدا زاڵە:

ئەی چاو! چەشنی بازی قەفەس هەڵوەری پەڕت، **a**
کوا باڵە تیژەکانی نیگای حوسنی دلبەرت؟ **a**
کوانێ دوو چاوی مەست؟ کوانێ؟ **b**
کوانێ برۆی پەیوەست؟ کوانێ؟ **b**
کوانێ زوڵفی ڕەش؟ **c**

کوڵمی ئاڵ و گەش؟ **c**
کوا هەیکەلی جەمال؟ **d**
کوا حوسنی بێ میثال؟ **d**

- **شیعر بە کێشی ئازاد**

لە شیعری گۆراندا ژمارەیەکی زۆر کەمی شیعری ئازادیش لێرە و لەوێ بەرچاو دەکەوێت کە سەروای خۆماڵییان هەیە. باشترین نموونەیان شیعری (ئاخ هەزار ئاخ، ل**١٨٥**)ە:

ئەی ئەوەی قەومانی بەش بەش کرد بە پێی خاک و زمان، a
دای بە هەر قەومێ نگین و تاج و تەختی حورِ ژیان! a

کوا نگینی بەختی من؟ b
کوانێ تاج و تەختی من؟ b

بۆ لە خاکی پاک و زار و بێ گرێم، c
غەدر ئەکەی؟ نابەخشی پێم؟ c

یا ئیلاهی هەقی خۆم داوا ئەکەم: d
کوا نگین و تەختەکەم؛ d

گومان لەوەدا نییە کە ئەم سەروایە چی لە شیعری کوردیی سەرزارەکییەوە وەرگیرا بێت، یانیش هەمان سەروای مەسنەوی بێت، لە کردەوەدا هەر هەمان شتە. واتا سیستەمێکی پێشوەخت دیاری کراوە و هەر وەکوو شیعرە کلاسیکەکانی تر، بەڵام ئەمجارە نەک لە ئاست هەموو شیعرەکە بەڵکوو لە ئاست دێڕی شیعری، یاسای یەکێتی سەروا دەپارێزێت. گۆران شێوازێکی تری سەرواسازی دێنێتە ئاراوە کە هەرچەند زیاتر لە نوێکردنەوەکەیدا نقووم دەبێت، بەکارهێنانی شێوازەکە زیاتر تێیدا پەرەدەستێنێت.

## سەرواى تێکەڵاو

لێرەدا سەروا پارێزراوە؛ بەڵام یەکێتیی سەروا بە شێوەیەکی تێکەڵاو و بە پێی حەزی شاعیر لە ناو شیعردا گۆڕانی بە سەردا دێت. سەروا یەکێتییەکەی دەپارێزێت. بەڵام جۆر و شێوازی یەکێتییەکە لە تاکە شیعرێکدا ڕەنگاوڕەنگە و پێڕەوی لە تاکە سیستەمێکی دیاری بڵاوکردنەوەی سەروا بەسەر دێڕەکاندا ناکات. واتا چەند سیستەمێکی جیاوازی ڕێزکردنی سەروا تێیدا دەبینرێن کە لە بەندێکەوە بۆ بەندێکی تر و هەندێ جاریش لە ناو بەندێکدا دەگۆڕێن. خودی گۆران لەم بارەیەوە دەڵێت:

**قاڵبی هەڵبەستی کۆن قەسیدە، غەزەل، پێنج خشتەکی، تەرکیب بەند... بووە، لە کاتێکا قاڵبی هەڵبەستی تازە ئەگەر لیریک (غینائی) بێ پارچەیەکی کورت، یان درێژ ئەبێ، کە پێکهاتووە لە ژمارەیەک بەندی دوو دێری یان ٣، ٤، ٥، ٦...تاد، کە قافیەی ئەم بەندانەش بە مەرجێک لە دوو دێری کەمتر نەبێ، بە گەلێ جۆری جیاواز پێکەوە ئەبەسترێن**[1]...

شیعری (تیر و کەوان، ل**٣٢٧**) یەکێکە لەو شیعرانە و گۆران لە دوا ساڵی ژیانیدا نووسیویەتی و لە بەردرێژییەکەی ئێمە تەنیا پارچەیەکی لێ دەخەینەڕوو:

ئەو ئاسمانە شینەی ژوور سەر a
کۆتری سپیی تیا خول ئەدا b
بە بێ خەتەر، a
مژدەی گوڵ بە بلبل ئەدا. b

لەو ئاسمانە، c
گڕی سپی ئەو باڵانە: c

---

(١) سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٨.

ئاوێنەی ئارامی ژینە، d
کۆشی وەنەوزی شیرینە؛ d
ڕوونی ئەخاتە شەبەقمان؛ e
سێبەر ئەکا بۆ ئارەقمان، e
بەری ڕەنجی تاڵمان بە لێو f
ئەکا بە هەنگوینی بێ مێو ... f

ئەگەر مەلی ئاسمانی شین g
باڵی بەیاخ نەبێ بۆ ژین، g
لە هیچ باخچە و بەهارێکا Ø
لە جێی دڕک گوڵ نابینین، h
گوڵ نابینین!... h

ئەوتاوانبارەی بۆ کوتر Ø
لە ژێی کەوان تیر گیر ئەکا، k

پارچەی جەرگی ناو بێشکەی خۆی، Ø
پێش هینی من نێچیر ئەکا! k

لەگەڵ ئەوەش دەستی چەپەڵ، m
ئابڕوو تکاو، n
هەر خەریکە، تەکەڵ تەکەڵ، m
بۆ ئاسمانی پڕ لە هەتاو n
تەپە دووکەڵ هەڵئەسێنێ، p
گڕی سپی ئەخنکێنێ!... p

بەندی یەکەمی شیعرەکە بە سەروای a b a b ڕازێنراوە. یەکێتیی سەروا بە دوو سەروای یەکتربڕ پێڕەو کراوە. لە بەندی دووەمدا سەروا نازدارەکەی گۆران cc dd ee ff کە سەروای فۆلکلۆرییە، جێ دەگرێت. لە بەندی سێیەمیشدا هەر هەمان شێوە دەبینرێت. تەنیا ئەوە نەبێت کە دێری سێیەم بێ سەروایە و سەروای h یش بە دووبارەبوونەوەی هەمان سەروا دروست بووە. گۆران بەمجۆرە لە یاسای کلاسیکی دوورەپەرێزی لە (ایطـــاء) لای داوە کە داوای لە شاعیران دەکرد وشەی سەروا دووبارە نەکەنەوە. چونکە بە نیشانەی نا شارەزایی شاعیر دادەنرا. لە بەندی چوارەمدا شاعیر سیستەمی دێڕی کلاسیکی بە کارهێناوە. واتا بەندەکە لە دوو دێڕ(ی دوو نیوە دێڕی) پێک دێت کە هەر وەکوو دێڕی قیتعەی کلاسیک، تەنیا کۆتایی دێڕەکان بە سەروا (ـیر) و ڕەدیف (ئەکا) ڕازێنراوەتەوە. لە بەندی پێنجەمدا لەوە دەچێت سیستەمی سەروای بەندی یەکەم و دووەم تێکەڵ کرابێت. شاعیر چوار دێڕی یەکەم ـ وەکوو سەروای بەندی یەکەم ـ بە سەروای یەکتربڕ بەیەکەوە دەبەستێتەوە و دوو دێڕی دوایی بەندەکە ـ لە شێوەی سەروای بەندی دووەم ـ بە سەروای فۆلکلۆری. ئەوەی شایانی گوتنە ئەوەیە کە یەکێتی سەروا لە هەموو ئەم سەروایانە دا بە شێوەیەک لە شێوەکان پارێزراوە و ناکرێ لێرەدا باس لە سەروای تەواو سەربەست بکەین.

## سەروای ناوبەناو

ئیتر لێرەدا سەروای پێشوەخت دیاریکراومان نییە. سەروا هەندێ جار ناو بە ناو دیار دەبێت و هەندێ جاریش نامێنێت. جاری وا هەیە جۆرە ڕیتمێک لە ڕێزکردنی سەروادا بە دی دەکرێت کە تا کۆتایی شیعرەکە بەردەوام نابێت و زوو گۆڕانی بە سەردا دێت. هەرچەندە

ژمارەی ئەو شیعرانەی هەڵگری ئەم جۆرە سەروایەن لە بەرهەمی گۆراندا لە چاو جۆری پێشوو زۆر نییە. (هەر وەک کەرەم، ل **٤٥٥**) یەکێکە لەم شیعرانە:

هەوا قورسە هەر وەک گوللە a
هاوار ئەکەم
هاوار ئەکەم
هاوار ئەکەم b
ڕاکەن، وەرن، c
منم ئەدەم b
ئیزنی دەستڕێژ
ئیزنی گوللە ! ... a
وتی بە من : c
تۆ ئەسووتێی f
بە ئاگری دەنگەکەی خۆت،
ئەبی بە خۆڵ؛
هەروەک کەرەم b
گڕی عەشقی خۆی بەربوو تێی ! f

لەوانەیە باشترین نموونە بۆ سەرواسازیی ناوبەناو شیعری (بت، ل**٤٨٣**) بێت کە تێیدا هەست بە یەکێتی سەروا ناکرێت و شاعیر بە ویستی خۆی و بە گوێرەی پێویستیی مانای شیعرەکەی، بەڵام بە شێوەیەکی ناڕێک و ناوبەناو هەندێ لە دێڕەکان بە سەروا پێکەوە گرێ دەدات:

ـ کێ شکانی سەری بت؟ a
ـ سەری بت ئێمە شکانمان ئێمە! b
ـ چوار پەلی ئەسپەکەیی کێ پەی کرد؟ Ø
ـ ئێمەیی داس بە دەس بووین، ئێمە! b
ـ ورگی بت کێ بوو دڕی؟ c
نەدڕاوە سکی بت a

نەدڕاوە،     d
کێ دیی؟     c
بدڕە ئەی دەستی بە هێزی هاوڕێ:     Ø
ڕێی سبەینێ یی مەزن     Ø
بدڕە ڕووپۆشی فەساڵی بتی شووم     Ø
تا ببینین کە لە سەر ناوچاوی     c
ناوی کێ نووسراوە؟     d
ناوی ئەو پیاو کوژە وا (ئازەر) و (تیر)     Ø
خوێنی گەلمانی ڕژان..     Ø
[...]

لەم پارچە شیعرەدا تەنیا دوو دێڕ بە پێی پێناسەی کلاسیکی سەرواسازی هاوسەروان و بە d دەستنیشان کراون. لە دێڕەکانی تردا ئەوەی بە پێی پێناسەی کۆن ناوی سەروای لە سەر دابنرێت، نابینرێت. تەنیا هەندێ دێڕ واتا ئەوانەی بە a، b، و c دەستنیشان کراون لە کۆتاییاندا جۆرە لێکچوونێک بەدی دەکرێت. ئەگەر وشەی **بت** لەم شیعرەدا بە ڕەدیف دابنێین، دەبێت سەروایەک لە پێش ڕەدیفەکەدا هەبێت. لە دوو دێڕەکەدا دوو وشەی پێش **بت** بریتین لە **سەری**، **سکی**. بەڵام ئەم وشانە بە پێی پێناسەی کۆنی سەرواسازی، پێکەوە سەروا دروست ناکەن. بە هەمان شێوە ئەگەر وشەی **ئێمە** بە ڕەدیف دابنێین پێویستیمان بە سەروای پێش ڕەدیف هەیە. بەڵام وشەکانی **بووین** و **شکانمان** سەروا پێک ناهێنن. بە هەمان شێوە وشەکانی **دڕی**، **دیی** و **ناوچاوی** بە پێی پێناسە کلاسیکەکانی سەروا، بە سەروا ناژمێردرێن. بەڵام لەو دێڕانەدا کە بە d دەسنیشان کراون، وشەکانی **نەدڕاوە** و **نووسراوە** لە **اوە** دا هاوسەروان[1]. لەگەڵ ئەوەشدا دووبارە بوونەوەی وشەیەک لە کۆتایی ئەو دێڕانەی هاوسەروا نین، یان لێکچوونی دەنگی کۆتایی دواوشەکانی هەندێ لە دێڕەکان، ئەگەر سەرواش دروست

---

(١) ماهیار، ع، *عروض فارسی، شیوەای نو برای آموزش عروض و قافیە*، چاپ پنجم، تهران، نشر قطره، ٢٠٠٠/١٣٧٩، ص ٢٧١-٢٨٧.

ناکات، بە بێ کاریگەری نییە. چونکە تەنانەت ئەگەر بە لێکچوونی دەنگەکانیشەوە بووبێت، ڕەنگ و ڕووی سەروا دەگرێتەوە خۆی.

شایانی باسە لەم شیعرەدا گۆران بە ئاشکرا پێ لە سەر یاسایەکی کلاسیکی سەرواسازی دادەنێت. ئەویش دووبارە بوونەوەی هەمان وشەیە لە سەروا. دیارە **ئێمە** ناکرێت بە ڕەدیف بژمێردرێت. چونکە سەروای لە پێشدا نییە. واتا گۆران دوو وشەی هاوشێوە و هاوواتای لە شوێن سەروادا بە کار هێناوە. ئەمەش لە سەرواسازی کلاسیکدا بە خەوشێکی دیاری سەروا و بە نیشانەی لاوازیی شاعیر لە قەڵەم دراوە و داواش لە شاعیران کراوە خۆیان لەو جۆرە بە کارهێنانە کە بە **(ایطاء)**[1] دەناسرێت، دوورەپەرێز ڕابگرن.

ئەم شیعرە دەکرێ بە لووتکەی ئازادیی سەروا لە شیعری گۆراندا لە قەڵەم بدرێت[2]. بەڵام گۆران هەرگیز بە تەواوی واز لە سەروا ناهێنێت. بەڵکوو لە زۆربەی شیعرەکانیدا بە جۆرێک لە جۆرەکان جێی بۆ دەکاتەوە و بە شێوەی کلاسیک یان خۆماڵی یانیش ناوبەناو بە کاری دێنێت[3].

(١) گەردی، ع، (**١٩٩٩**)، ل **٣٤٢-٣٤٣.**

(٢) لەوانەیە ئەم ئازادیە لە بەر ئەوە بووبێت کە شیعرەکە وەرگێڕانی شیعرێکی فارسییە و شاعیر بۆ پاراستنی مانا گشتییەکەی شیعرەکە ناچار بووە لە بەکارهێنانی سەروادا ئازادی بنوێنێت.

(٣) لەوانەیە ئەو پرسیارە لە لای خوێنەری بەڕێز بوروژێتەوە کە بۆچی ئێمە لە ناوەرۆکی لێکۆڵینەوەکەماندا باس لە ئۆپەرێت (وەکوو گۆران خۆی ناوی لێ دەنێت) وەکوو یەکێ لە هەنگاوە نوێیەکانی گۆران ناکەین. ڕاستە بە کارهێنانی ئۆپەرێت لە شیعری کوردی دا دیاردەیەکی تازەیە؛ بەڵام ئەم ژانرە شیعرییە لە ڕووی کێش و سەرواوە شتێکی نوێتر لەوەی باسمان کرد، پێشکەش ناکات. چونکە کاتێ باس لە نوێکردنەوەی شیعری دەکەین، زیاتر چۆنیەتی کێش و سەروای قاڵبەکەمان پێ مەبەستە. بەواتایەکی تر هەریەک لەم ئۆپەرێتانە لە ڕووی کێش و سەرواوە لە گەڵ یەکێک لەو جۆرانەی لە بەشەکانی کێش و سەروادا باسمان کرد، دەگونجن. بۆ نموونە (شێوەنی دارستان، ل **٣٦٤**) سەرتاپا بە کێشی (**٤+٤+٤**) دوانزە بڕگەیی و سەروای دێڕ (مەسنەوی) هۆنراوەتەوە. (وڵاتی ئاوا، ل **٣٦٨**)یش بە هەمان سەروا و بە کێشی یانزە بڕگەیی (**٤+٤+٣**) هۆنراوەتەوە. کەچی (ئەنجامی ئەژدەهاک، ل **٣٥٢**) بە کێشی بڕگەیی ئازاد و سەروای تێکەڵاو هۆنراوەتەوە. بەشی یەکەمی (موحاکەمەی مام چەوەندەر، ل **٣٧٣**) بە کێشی چوار بڕگەیی و سەروای کلاسیک و بەشی دووەمیشی بە سەروای کۆن و کێشی هەشت بڕگەیی (**٤+٤**) هۆنراوەتەوە...

# زمانی شیعریی گۆران

## بە کوردی کردنی وشەگەلی شیعری

لە پێشەکیی ئەم بەشەماندا باسمان لە کاریگەریی بەرچاوی شیعری فارسی و عەرەبی لە سەر شیعری کلاسیکی کوردی کرد. کاریگەرییەکەش بێگومان لەو ژمارە زۆرەی وشەی فارسی و عەرەبیدا ڕەنگدەداتەوە کە جێیان لە شیعری کلاسیکدا خۆش کردۆتەوە. لەوانەیە زۆربەی وشە عەرەبییەکانیش لە ڕێگەی شیعری فارسییەوە ڕوویان کردبێتە ناو شیعری کوردی. چونکە وەکوو پێشتریش گوتمان، دیوانی شاعیرە کلاسیکە گەورەکانی فارس سەرچاوەی فێربوون و چێژوەرگرتنی هونەریی شاعیرە کوردەکان بوون. لە لایەکی تریشەوە بە کارهێنانی وشە و زاراوەی بیانی لە شیعری کلاسیکدا نیشانەی شارەزایی و لێهاتوویی شاعیر بوو. چەنێک شیعرەکە وشەی بیانیی زۆرتری بە خۆیەوە بگرتبایە، ئەوەندە پایەی لە ڕووی هونەرییەوە بەرزتر دەبوو[(١)]. بۆیە شیعری کلاسیک شیعری چینێکی تایبەت واتا چینی نوخبەکان بوو و ئاراستەی پیاوە خوێندەوار و ڕووناکبیرەکان دەکرا و هەر تەنیا ئەوان بوون کە توانای تێگەیشتن لە مانای وشە بیانییەکان و مانای خودی شیعرەکانیان هەبوو. ئەم تایبەتمەندییە لە زمانی شیعری کوردیدا تا کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەم بەردەوام دەبێت[(٢)]. بەلای گۆران ئەو زمانانەی کاری زۆریان کردۆتە سەر وێژەی کوردی، دوو ڕێژگەی جیاجیا دروست ئەکەن:

---

(١) شێخ، ع، ئەزموونی *شیعری کوردی*، هەولێر، ؟، ٢٠٠١، ل ١٠٤.

(٢) رسول، ع، (١٩٨٥)، ل ١٩٩.

**ڕێژگەی یەکەم ئەو کارتێکردنەیە، کە لە سەردەمی مێژووی پاش موسڵمانیدا لە زمانەکانی فارسی و تورکی و عەرەبییەوە ڕووی کردۆتە زمانی وێژەی کوردی تا سەردەمی تازەی ئێستامان لەمانە فارسی و تورکیش لە نۆرەی خۆیاندا دووبارە کەوتوونەتە ژێر کارتێکردنی زۆری عەرەبی. لە بەر ئەوە و لە ناو ئەم ڕێژگەیەدا کاری زمانی عەرەبی ئەبێ بەهێزی سەرەکی دابنرێت**[1].

لە هۆنراوە کلاسیکەکانیدا، گۆران بە لاسایی کردنەوەی زمانی شیعری کۆن، دوودڵی لە بە کارهێنانی وشەی بیانی ناکات[2]. ئەم دیاردەیە لای گۆران بە هۆی ئاشنایەتیی لەگەل شیعری تورکیی عوسمانی زەقتر و بەهێزتر دیارە. ئەم ڕاستییە لە نموونەی خوارەوەدا ڕوون و ئاشکرایە کە تەنیا بەندێکە لە شیعرێکی چوار بەندیی گۆران. وشە بیانییەکان بە خەتی ژێریانەوە دیاری کراون: (**مەدەنییەت، ل ٧١**)

مەدەنییەت: گوڵی بەهاری حەیات،
مەدەنییەت: هەوایی نەشئو نوما،
مەدەنییەت: وەسیلەیی ئیحیا،
بۆ هەموو میللەت و عومومی وڵات،

مەدەنییەت، ئەلکتریک، قەمەر
ئەی ضیا بەخشی حاڵی نەوعی بەشەر!
[...]

نموونەی سەرەوە لە کۆمەڵە شیعری یادگاری کۆن وەرگیراوە کە (کەنیشکە جوانەکە!، ل ٧٠)ش یەکێکە لە شیعرەکانی. لە سەرووی ناوی شیعرەکە هاتووە: « لاسایی ئەدەبی عوسمانی »

ئێمەش چەند دێڕێکی لێ دەخەینە ڕوو و وشە بیانییەکانیشی دەستنیشان دەکەین.

کەنیشکە جوانەکە بۆ چی فریبی حوسن و جەمال

---

(١) ئاشنا، ئ، (٢٠٠٢)، ل ١٤٠.

(٢) شانوف، ح، (١٩٧٥)، ل ١٨١.

هەڵت ئەداتە سەمایی تەکەببور و عەظەمەت!
(الی الابد) نی‌یە بۆ کەس مەلاحەت و شەوکەت
هەموو بەهارێ مرووری سەریعە بەرق میثال!

کەنیشکە جوانەکە: گوڵباغی شۆخ و ڕەونەقدار،
کە ئێستە مەوقیعی باڵایی سەرتە مەستی غروور،
ئەبینی ئاخری ڕۆژێ سوقووط ئەکا مەقهوور،
لە ژێری پێ یی عەجووزا ئەبێتە تۆز و غوبار!
[...]

هەموو ئەو وشانەی خەتیان لە ژێرەوەیە، عەرەبین. ئێمە نازانین گۆران ئەم وشانەی یەکسەر لە زمانی عەرەبییەوە وەرگرتووە یان لە شیعری فارسی یان تورکییەوە. چونکە لە لایەکەوە زۆربەی ئەم وشانە لە زمانی فارسیشدا بەکاردێن و لە لایەکی تریشەوە شیعرەکە بە لاسایی شیعری تورکی عوسمانییەوە هۆنراوەتەوە. لە نووسینەکانی خودی گۆراندا دیارە تا چ ڕادە خۆی ئاگاداری ئەم ڕاستییە بووە و چەند هەوڵی گۆڕینی داوە. لە سەرەتای کۆمەڵە شیعری *بەهەشت و یادگار* دا بەم جۆرە لەم بابەتە دەدوێت:

**(بەهەشت و یادگار) کۆمەڵە شیعرێکە لە دیوانەکەم سەرانسەر لە گەڵ بابەتەکانی جوانی و دڵداری خەریکە. هەڵبەستی وای تیایە بیست و پێنج ساڵ، بەڵکو زیاتر، لەمەو پێش دانراوە، هەر وەکو هیی چەند مانگێک لەمەو بەریشی تیایە. بەشی زۆری کۆنەکان بە وەزنی عەرووض وە کوردی یەکی کۆنی تێکەڵاو بە زمانی بێگانە نووسراون....**

**هەروەکوو گوتم تا چەند ساڵێک لەمەوبەر بە وەزنی عەرووض شیعرم وتوە، بە وەزنی پەنجەش لە زۆر کۆنەوە، بەڵکو لە گەڵ وەزنی عەرووض شان بە شانی یەک، دەستم کردوە بە هەڵبەست دانان. ئەمانەش لە دابەش کردنی ناو دیوانیانا، زۆرتر بابەتیان، نەک ئوسلووب و وەزن و زمان، خراوەتە بەر سەرنجی بایەخ. لە بەر**

**ئەوەی ڕێگای هەرە چاک بۆ جوێ کردنەوەی تازە و کۆنیان، وردبوونەوە لە زمـان و لوغەتی پێنووسینیان ڕاسپێری ئەکەم، هەچ هەڵبەستێک وشە و تەرکیبی عـەرەبی و فارسـیی زۆر تیـابێ، بـە ئەنـدازەی ئـەو زۆریـە، کۆنـە، پێچـەوانەی ئـەوەش دیارە پێچەوانەیە!**

**دوایی لە کاتی نووسینەوەو ئامادەکردنی ئەم نامیلکەیەدا بۆ چـاپ، لـە شـیعرە کۆنەکاندا هەندێ وشەو تەعبیری چەوت تووش هاتم ئەمتوانی بیانگۆڕم بـە وشـەی کوردیی پەتی، یان بە چەشنێکی پەسندتر و دڵگیرتر دەستکاری یان بکەم.**

**بەڵام ئەمە، لە باری سەرنجی ئەو کەسانەوە کە بە شوێن لێکۆڵینەوەی تەئریخی ئەدەبی کورد، وە چۆنیەتی گەشەکردن و گۆڕانی زمـانی کوردیـدا ئەگەڕێـن، زیـانی زۆرترە لە سوود، با بێزاریی خۆیشم لـەولاوە بوەسـتێ لـە تەقـەلای شـاردنەوەی خەوش و ناتەواویم بە چەشنێکی لە ئەندازە بەدەر، بەڵکو لـە سـنووری ئەنـدازەی تێکۆشینی خەڵقی تریشا.**

**لە بەر ئەوە بڕیارم دا دەستی دەستکاری یان کەم و زۆر بۆ درێژ نەکـەم، وە هـەر وەکو هەن و بوون بیانخەمە پێش چاوی خوێندەوارانی خۆشەویست!**[1]

دیارە کە بۆ گۆران وشە بیانییەکان شوێن پەنجەی کلاسیزمن. بۆیـە نوێـکردنەوە خـۆی لـە گۆڕینـەوە و لادانیانـدا دەنوێنێـت. خـۆی لـەو ڕاستییە ئاگـادارە کـە بـوونی وشـە بیانییـەکان لـە شـیعری کوردیـدا لـە سەر حسابی وشەی ڕەسەنی کوردی بووە. بۆیە وردە وردە دەست بـە گۆڕینـــەوەیان دەکـــات بـــە وشـــەی کـــوردی. یەکێـــک لـــە ئەنجامـــە ئەرێنییەکانی ئـەم پرۆژەیـەش جێـگیربوونی ژمارەیـەکی زۆری وشـەی کوردی تازەیە لە ناو فەرهەنگی وشە و زاراوەی شیعری کوردیدا[2]. لـە ژمـارە **٥١**ی گۆڤـاری ئـازادیی سـاڵی **١٩٦٠** دا بـەم شێـوەیە بـاس لـەم پرۆسەیە و گرنگیی دەکات:

---

(١) گۆران، (**١٩٨٠**)، ل **٣**-**٤**.

(٢) بێکەس، ش، (**١٩٧٨**)، ل **٦٠**.

**لێرەدا نامەوێ چاو لە هەندێ ڕاستی بپۆشم، بە وێنە لە چاوپێودانە تەسکەکەی دەسەڵات و زرووفمانا، لە نوێکردنەوە و پۆشتەکردنەوەی شێـوە -زمانـە- کـەمانا هەنگاوی پێشکەوتنمان ناوە، ژمارەیەک وشەی بێگانەی ناڕەوا بە کارهاتوومـان واز لێ هێناوە لە باتی ئەوانە وشەی کوردیی ڕەسەنی لە کۆنەوە کەنەفت کراومـان لـە کون و قوژبن دەرهێناوە، لە شوێنی هەندێکیانا دامان ناوە، هەندەکەی تریشیان یـا لە ڕەگی وشەی شێوەکەی خۆمان بەرامبەری تازەمان بۆ تاشیون، یان چـووین لـە شێوەکانی تری کوردیدا هاو (واتا)مان بۆ دۆزیونەوە.**

**بەڵام بەم جۆرە تەقەلایانە لە شێوەکەمانا بنەڕەتی زمانێکی نووسین پەیدا بووە، کە وەک لە سەرەوە وتمان، ئاراستەکەی بۆ ئەوە ئەچن، کە نووسەر بە هەچ نرخێـک بووە ئەبێ خۆی بپارێزێ لە کارکردنی وشەی بێگانە لە بەرهەمی نووسینیا.**

**وشەی بێگانە لە کوردیدا بە خانەی هەزاران نەبێ ناژمێررێ، لە کاتێـکا ئـەوەی تا ئێستا توانیومانە بەرامبەری بـۆ بدۆزینـەوە ژمـارەی لـە چـەند سەدێـکی کـەم زۆرتر نییە**[1].

گومان لەوەدا ناکرێت کە بوونی ژمارەیەکی زۆری وشـەی بیـانی لـە شـیعری کلاسـیکی کوردیـدا خـۆی لـە خۆیـدا کۆسپێـک بـوو لـە نێـوان شـــیعری کلاســـیک و چـــینە جیاوازەکـــانی کۆمـــەڵگادا. خوێـــندن و تێگەیشـتنی شـیعری کلاسـیک بـە هـەموو کـەس نـەدەکرا و خوێـنەری تایبــەتی خــۆی دەویســت. تەنانــەت بــۆ تێگەیشتنێـکی ڕوواڵــەتیی شیعرەکانیش ناسینی زمانە بیانییـەکان لـە لای خوێنەرەوە مەرجێکی پێویسـت بـوو. وەکـوو چـۆن ئێسـتاش تێگەیشتنێـکی سـەرەتایی لـە شـیعرەکانی مـەلای جزیـری بـەبێ ناسـینی زمـانی عـەرەبی و فارسـی کارێـکی ئەسـتەمە و خوێـنەر بـۆ تێگەیشـتنی مانـای وشـە و زاراوە بیانییــە بــەکارهاتووەکان لــە تەنیشــت دیوانەکــەدا پێویســتیی بــە فەرهەنگێـکی لێـکدانەوەی ڕامـانی وشـەکان هەیـە. بـەم جـۆرەش

---

(١) ئاشنا، ئ، (٢٠٠٢)، ل ٣٧.

ژمارەیەکی زۆری خەڵک بە هۆی کەمیی ئاستی خوێندەوارییان لە خویندنی شیعری کلاسیک بێبەش دەبوون. ئەمە بە پێچەوانەی یەکێک لە ئامانجە سەرەکییەکانی گۆرانی شاعیرە کە دەیەوێت ژمارەیەکی هەرە زۆری خوێنەر لە دەوری شیعرەکانیدا کۆبکاتەوە. پاش قۆناغە ئەزموونییەکەی کلاسیک، شیعرەکانی گۆران لە ڕووی بابەتەوە ڕەنگ و هەوای ڕۆمانتیکییان پێوە دیاربوو. بەڵام هەر زوو لەو ڕێبازە لادەدات و ڕوو لە ڕیالیسم و ڕیالیسمی سۆسیالیستی دەکات و دەوری شاعیرێکی پێگیر(ملتزم) دەبینێت. شیعرەکانی پڕ دەبن لە وشە و زاراوەی ڕامیاری و کۆمەلایەتی و ئاراستەی هەموو چین و توێژەکانی کۆمەڵگا دەکرێن[1]. زمانە تێکەڵاوەکەی شیعری کلاسیک ئاستەنگە لە بەردەم ئەم مەبەستە. بۆیە گۆران شیعرەکانی بە زمانێکی ڕەوان و بە وشە و زاراوەی کوردی دەنووسێت و ئەوانەش کە پێشتر نووسراون و وشەی بیانی یەکجار زۆریان تێدایە، دەستکاری دەکات و وەکوو خۆشیی لە سەرەوە ئاماژەی بۆ دەکات، تا ئەو ڕادەیەی پێی دەکرێ و لە زیانی زمانی کوردیدا نییە، وشەبیانییەکان دەکاتە کوردی. ئەم کارە لە لای گۆران بە بێ پێشینە و هزری ڕامیاری نییە. کەرەستەی هونەری شیعر زمانە و زمانیش لە وشەکان پێک دێت و لە هەمان کاتیشدا ناسنامەی نەتەوایەتیی هەر گەلێکە. بۆ پاراستن و بەهێزکردنی ناسنامە کوردییەکەی شیعرەکان چارەیەک نییە جگە لە بە کوردی کردنی زاراوە بیانییەکان. مادام بوونی ژمارەیەکی زۆری وشەی بیانی لە شیعردا، فاکتەرێکە کە نوێنەرایەتیی سەروەریی داگیرکەری بیانی دەکات، دەبێت هەموو هەوڵەکان بەرەو نەهێشتنی ئەو فاکتەرە ئاراستە بکرێن. لە ڕاستیشدا هەستی نەتەوایەتیی گۆران

(١) رسول، ع، « ڕیالیزمی نوێ و ئەدەبیاتی کوردیٚ» لە *ڕۆشنبیری نوێ*، بەشی یەکەم، ژ **١٢٢**، بەغدا، دەزگای ڕۆشنبیری و بلاو کردنەوەی کوردی، **١٩٨٩**، ل **٦٢**.

یەکێکە لە سەرچاوەکانی پرەنسیپی بە کوردی کردنی زمانە شیعرییەکەی کە لە هەمان کاتدا هاوکاتە لەگەڵ پەیدابوونی هەوڵ و کۆششی لەمجۆرە لە ئەدەبیاتی تورکی و فارسیدا(١).

ناکرێت لەم هەنگاوەی گۆراندا کاریگەریی شیعری تورکیی سەرەتای سەدەی بیستەم لە بیر بکەین:

**لە سەرەتای ئەم سەدەیەی ئێستا و، لە ناو تورکە عوسمانییەکاندا جووڵاندنەوەی تورکاندنی (تتریک)ی هەموو دەزگا و ڕواڵەتەکانی کۆمەڵایەتی کەوتبوونە گوڕسەندن، تێکۆشین هەتا بڵێی گەرم بوو بۆ گۆڕینی ئەلفوبێ و، بۆ بژاردنی زمانی تورکی**(٢)..

لەگەڵ ئەوەشدا نابێت ئەم کارەی گۆران ـ وەکوو هی تورکەکانـ بە هەوڵێکی ڕەگەزپەرستانە لە قەڵەم بدرێت. چونکە گۆڕانکارییەکە لای گۆران، پرۆسەیەکی ڕەها و بێ مەرج نییە. خۆی لە پێشەکیی کۆمەڵە شیعری (بەهەشت و یادگار) دا باس لە بێسوود بوونی هەر هەوڵێکی ڕادیکالی لەم جۆرە دەکات کە زیان بە ڕێڕەوی سروشتیی پەرەسەندنی زمان دەگەیەنێت. لە بەر ئەوەی بوونی پێوەندی لەگەڵ زمانانی تر هۆیەکی پەرەسەندن، زیندوومانەوە و دەوڵەمەند بوونی هەر زمانێکە. بۆیە گۆران نە لەگەڵ بە کارهێنانی لە ڕادەبەدەری وشە و زاراوەی بیانییە و نە بە تەواوی لەگەڵ پاک و خاوێن کردنی سەد لە سەدی زمانی شیعرە لەم وشە و زاراوانە؛ بەڵکوو لەگەڵ چارەسەرێکی گونجاو و مام ناوەندییە.

لە هەوڵێکی بێ وێنەدا و بۆ ئەوەی مانای ئەو وشە کوردییە تازانەی لە شیعرەکانیدا بە کاریان دێنێت بۆ خوێنەرێک کە بە وشەی بیانی لە شیعری کوردیدا ڕاهاتووە و لەوانەیە مانای وشە کوردییە

(١) لە بەشی سێیەمدا بە درێژی لەم بابەتە دەکۆڵینەوە.

(٢) ئاشنا، ئ، (٢٠٠٢)، ل١٥٧.

پەتییەکان نەزانێت، ڕوون و ئاشکرا بێت، گۆران مانای کوردی، فارسی یان عەرەبیی وشەکان کە لای خەڵک ناسراون یانیش پێشتر لە شیعری کلاسیکدا باو بوون، لە پەراوێزی شیعرەکەدا دەخاتە ڕوو[1]. لێرەدا هەندێ لەو وشانە بە ماناکانیانەوە هەر وەک چۆن لە دیوانی گۆراندا هاتۆنەتەوە، دەخەینە ڕوو:

**دۆزەخ**: جەهەنم (ل ٤١)

**ناخ** : قەعر، بن (ل ٤١)

**خەوش**: عەیب، ناتەواوی (ل ٨٨)

**خایەندن**: خایاندن، دەوام کردن (ل ٩٥)

**وەرز**: مەوسیم (ل ١٢٧)

**تەق تەق**: ڕێگای بەردەلانی پلەپلە (ل ١٢٨)

**کێڵ**: خانووی هاوینەی ناو باغ (ل ١٢٨)

**زیز**: عاجز، مات (ل ١٦٣)

**ئایین**: من لە هەموو کاتێکا ئایین لە باتیی دین بە کار ئەهێنم. (ل ١٧٠)

بۆ ئەو وشە بیانیانەش کە گۆران دەستکارییان ناکات و لە شوێنی خۆیاندا بە جێیان دەهێڵێت، واتای کوردییان لە پەراوێزی شیعرەکاندا دەخاتە ڕوو:

**ئیحتیضار**: سەرەمەرگ (ل ١٥)

---

(١) محمدی مەلا کریم کە سەرجەمی بەرهەمی گۆران (بەگی یەکەم)ی کۆ کردۆتەوەو ئامادەی کردووەو پێشەکی و پەڕاوێزیشی بۆ نووسیوە، لە پێشەکییەکەیدا، لاپەڕە ــلــ دەڵێت:

«مامۆستا گۆران خۆی هەندێ وردە پەڕاوێزی لە (بەهەشت و یادگار) و (فرمێسک و هونەر) ە کەیدا و هەروا لەسەر چەند پارچەیەکی کۆمەڵەی (سروشت و دەروون)یش نووسیوە. ئێمە ئەو پەڕاوێزانەی ئەومان وەک خۆیان بڵاو کردوەتەوەو، خۆیشمان لە هەندێ شوێندا هەندێ پەڕاوێزمان نووسیوە. بە مەبەستی تێکەڵی یەک نەبوونی ئەو پەڕاوێزانە ئێمە و مامۆستا، لە داوێنی پەڕاوێزەکانی خۆمانەوە نیشانەی (م.م.ک.)مان داناوە. بەم جۆرە هەر پەڕاوێزێک لەم دیوانە دا ئەو نیشانەیەی پێوە بێ هیی خۆمانە و هەر کامیش پێ یەوە نەبێ هیی مامۆستا گۆران خۆیەتی.»

**جیلوە**: لە (جلی)وە، دەرکەوتن، درەوشانەوە. (ل ٤٠)

**فەرامۆش کردن**: لە بیر بردنەوە (ل ٤٠)

**ئاهیستە**: بە ئەسپایی، لە سەرخۆ (ل ١٧٢)

**تەلاطوم**: شڵەقان و شەپۆل دان (ل ١٧٢)

**ئەنین**: ئاخ و ناڵە (ل ١٧٣)

**ئەشک**: فرمێسک (ل ١٧٣)

**تابان**: شەوق هاوێژ، ڕووناک (ل ١٧٣)

با ئەمجارە نموونەیەک لە دوا شیعرەکانی گۆران بخەینە ڕوو بۆ ئەوەی ڕادەی جیاوازیی ئەم شیعرە لەگەڵ نموونەکانی پێشوودا لە ڕووی بە کارهێنانی وشەی بیانییەوە بزانین:

( **گۆرانی گەلانی جیهان، ل ٤٥٣**)

(١)

یەکمان ئەخا یەک هیوا،
لەم پەڕ هەتا ئەو پەڕی دنیا..
ڕێمان پێ بگرێ دوژمن،
بێ گومان سەر ئەدا لە ئاسن!
لاوان گەر دەنگ هەڵبڕن،
گەلان گشت ڕائەپەڕن ..
گۆرانیی لاوان،
پڕ ئەکا ژیان،
لە شادی بۆ هەموو ..

(دەور)

بەستە بۆ شادی ئەڵێن گشت لاوەکان ..
لاوەکان .. لاوەکان ..
چۆن لە بەرمانا ئەوەستن دوژمنان؟

دوژمنان؟

لەگەڵ لاوان،

ئەڵێن گشت جیهان،

بە یەک زمان :

چۆن لە بەرمانا ئەوەستن دوژمنان؟

دوژمنان؟دوژمنان؟

**(٢)**

لە بیرمانە کۆڕی جەنگ:

چۆن پڕ بوو لە مەیتی شەهیدان..

ئەو خوێنەی خاکی کرد ڕەنگ،

بوو بە مۆری برایی گەلان..

دەسا ئەی تێکۆشەران!

بۆ داد و ئاشتیی جیهان،

بگرن ڕێی خەبات..

بگەنە ئاوات..

بگەنە ئارەزوو..

**(٣)**

دەنگی زوڵاڵمان، بە سوێن،

ئامانجێکی پاک ئەدا بەڵێن..

سەربەرزی بڕوامانین..

بە ڕاستی دڵسۆزی ئینسانین ..

بەڵام هێزە گومڕاکان،

بوون بە هۆی تاڵی ژیان!

با بمرێ خوێنمژ!

شەڕ فرۆشی پیاوکوژ..

سەرکەوێ ئاشتی، زوو!..

لەم شیعرەدا ئەو وشانەی کە لە بنەرەتەوە وشەی بیانین، بریتین لە پێنج وشەی **دنیا**، **مەیت**، **شەهید**، **زولاڵ**، **ئینسان**. بە تێڕوانینێکی ورد بۆمان دەردەکەوێت کە جگە لە دوو وشەی **مەیت** و **زولاڵ**، لە کاتی خوێندنی سێیانی تر لە شیعرەکەدا، ئەو هەستەی بە خوێندنی وشە بیانییەکانی یادگاری کۆن لە لامان دروست دەبێت، دووبارە نابێتەوە. چونکە ژمارەی وشە بیانییەکانی شیعرەکە لە چاو درێژییەکەی زۆر کەمترە لە نموونەی پێشوومان. تەنانەت وشەکانی **دنیا**، **شەهید** و **ئینسان** جێی خۆیان لە ناو زمانی کوردیدا ( بە تایبەتی لە کاتی قسەکردن دا) کردۆتەوە و ئەوەندە هەست بە بیانی بوونیان ناکرێت. بۆیە شاعیر بە پێویستی نەزانیوە بیانگۆڕێت. گۆران بە ئاسانی دەتوانی وشەی **دنیا** لا ببات و وشەی **جیهان** لە شوێنیدا بە کار بێنێت. چونکە دواتر دوو جار وشەکە لە کۆتایی دوو دێڕی شیعرەکەیدا لە بەندەکانی (دەور) و ـ**٢**ـ دا بە کار دێنێت:

......
ئەڵێن گشت جیهان،
.....
بۆ داد و ئاشتیی جیهان،
.....

و لە بەر دوورییان لە یەکتر، هەست بە دووبارە بوونەوەکە ناکرێت و کێشەی سەرواسازیش دروست ناکات. ئەم کارە دەکرا لە بەندی ـ**١**ـ یشدا دووبارە ببێتەوە، بە بێ ئەوەی هەستی پێ بکرێت. بەڵام گۆران وشەی **دنیا** لە شوێنی خۆیدا دەپارێزێت. تەنانەت لە وشەی **مەیت** یش پاشگەز نابێتەوە، کە چی دەیتوانی وشەی **لاش** ی کوردی لە شوێنیدا بە کار بهێنێت کە ژمارە و جۆری بڕگەکانی و واتاکەی بە تەواوی لەگەڵ شوێنی وشەی **مەیت** دا دەگونجێت[1].

---

(**١**) هەردوو وشەی **مەیت** و **لاش** لە یەک بڕگە پێک دێن، لە وشەی **مەیت** دا سێ پیتی (مەی : cvc) سیلابێکی درێژ پێک دێنن و بە پێتی (ت) سیلابێکی کێشراو پێک دێنێت (cvcc). لە وشەی **لاش** دا دوو پیتی (لا: cv) بە هۆی درێژی بزوێنی (ا) سیلابێکی درێژ پێک دێنن و بە پیتی (ش) سیلابەکە دەبێتە کێشراو. کە واتا لە ڕووی جۆری بڕگە و دەنگەوە یەکسانن.

هەرچەندە لە بەر برگەیی و ئازادبوونی شیعرەکە جۆری وشەکان لە ڕووی ژمارە و جۆری برگەکانیانەوە بایەخی نییە و شاعیر دەیتوانی هەر وشەیەکی کوردی کە مانای **مەیت** دەگەیەنێت لە جیاتیدا بە کار بهێنێت. ئەمە جارێکی دیکە ئەو ڕاستییە دەسەلمێنێت کە بایەخدانێکی زیاتر بە وشە و زاراوەی کوردی لە لایەن گۆرانەوە لە ڕوانگەیەکی ڕەگەزپەرستانەوە نەبووە؛ بەڵکوو لە هەستی نەتەوایەتیی گۆرانەوە سەرچاوەی وەرگرتووە و ناکرێ زاراوەی پاککردنەوەی زمانی بۆ بە کاربهێنرێت. ئەم هەزرە لەلامان بەهێزتر دەبێت کاتێ دەبینین کە گۆران لە لایەکەوە وشە بیانییەکان لە شیعرەکەی دوور دەخاتەوە و لە لایەکی دیکەوە و بە تایبەتی لە شیعرەتازەکانیدا دەرگایان بۆ دەکاتەوە.

## بە کارهێنانێکی نوێی وشە و زاراوەی بیانی

ژینتامەی گۆران و ئەو شیعرانەی لە زمانە ڕۆژئاواییەکانی ئینگلیزی و ڕووسی وەری گێڕاوە و چاوپێکەوتنەکەی لەگەڵ عبدالرزاق بیمار، هەموویان شایەتی لە سەر دەوڵەمەندیی گۆران لە ڕووی ئاشنایەتیی لەگەڵ فەرهەنگی ئەدەبیی ڕۆژئاوا دا دەدەن. یەکێک لە دیاردە بێ نموونەکانی زمانی شیعری گۆران بریتییە لە بە کارهێنانی ژمارەیەکی بەرچاوی وشەی بیانی و بە زۆری ڕۆژئاوایی. لە موحازەرەکانی کە لە گۆڤاری ژیندا بڵاو بۆتەوە لەبارەی دووەم ڕێژگەی ئەم زمانانەی کاریان کردۆتە سەر ویژەی کوردییەوە[1]، دەڵێت:

**دووەم ڕێژگە، لە سەرەتای سەردەمی تازەوە، (کە بۆ ویژەی کوردی وتمان بۆ نیو سەدە لەمەوپێش ئەگەڕێتەوە) دەست پێ ئەکات. ئەم ڕێژگەیە لە شارستانییەتی تازەی ئەورووپا هەڵقوڵا؛ بەڵام شەپۆڵدانەکەی وەکو ڕێژگە کۆنەکانی مێژوو هەر بە ناوچەیەک، یان هەرێمێکەوە نەوەستا، سەرانسەری ڕووی دنیای گرتۆتەوە**[2]...

---

(١) ئاشنا، ء، (٢٠٠٢)، ل ١٤١-١٤٢.

(٢) یەکەم ڕێژگەمان لە لاپەڕە ١٢٦ی باسەکەماندا هێناوە.

ئەم وشانە دوو دەستەن. یەکەمیان وشە و زاراوەی ژیانی ڕۆژانە و کولتووری ڕۆژئاوایی و دووەمیان ئەوانەی ڕۆژئاوایی یان ڕۆژهەڵاتین و ئەنجامی ناوەرۆکی ڕامیاری شیعرەکانی گۆرانن.

**دەستەی یەکەم (ڕۆژئاوایی):**

هێما میتۆلۆژییەکانی یۆنانی کۆن: (زەووس، ڤێنووس: ل **٣٠**، ئەپۆلۆ: ل **٤٤**، کیووبید: ل **١٥١**، میرڕیخ: ل **٢٤٣**...)

وشە و زاراوەی ژیانی ڕۆژانە: (ئیسکارپین: ل **٣٤**، تانگۆ: ل **٥٥**، پرۆتستۆ: ل **٩٨**، دۆنکی، یانکی: ل **٢٤٦**...)

وشە هونەرییە ڕۆژئاواییەکان: (باند، نۆت، ڤاڵس، فۆکستڕۆت: ل **٥٥**، ئۆرکسترا، ئۆپێرا: ل **٣٠٣**...)

دەستەی دووەم (ڕۆژئاوایی و هەندێ جار ڕۆژهەڵاتی) :

سەرکردە و کەسایەتییە ڕامیارییەکانی سەردەم: (ماک ئارسەر، سینگمان ڕی: ل **٢٣٦**، کۆیسلینگ: ل **٢٣٨**، لەنین: ل **٣٠٦**..)

ناوی وڵات و پایتەخت و شارەکان: (کۆریا، بۆخارست، ڕۆمانیا: ل **٢٥٤**، واڵ ستریت، ل**٢٥٥**...)

ئەمە لە تێڕوانینی یەکەمدا بە پێچەوانەی ئەو هەوڵەی گۆران دێتە بەرچاو کە لە پێناو کەم کردنەوەی وشە بیانییەکانی ناو شیعرەکانیدا گرتبووە بەر. دیارە گۆران بە یەک شێوە تەماشای ئەم دوو دەستەواژە بیانییانەی (عەرەبی و فارسی ـ ڕۆژئاوایی) نەکردووە. لە لایەکەوە بە کارهێنانی وشەی ڕۆژئاوایی بە پێچەوانەی نەریتە کلاسیکەکان بووە کە تەنیا ڕێگەیان بە وشە عەرەبی، فارسی یان تورکییەکان دەدا بێنە ناو شیعری کوردی. لە لایەکی تریشەوە ڕاستە وشە ڕۆژئاواییەکانیش بیانین، بەڵام وەکوو وشەگەلی تر نوێنەرایەتیی نەتەوە داگیرکەرەکانی دراوسێ ناکەن. بە لامانەوە گۆران وشە بیانییەکانی دەستەی یەکەمی بە فاکتەرێکی پرۆسەی مودێرن کردنی شیعرەکەی زانیوە و پێی وابووە کە بەکارهێنانی ئەم وشانە لەگەڵ سروشتی ژیانی هاوچەرخدا دەگونجێت. سەبارەت بە دەستەی دووەمی وشەکانیش لە بیر نەکەین کە گۆران لە ڕووی

ئایدیۆلوژییەوە کۆمۆنیست بووە و هەستی ئەنتەرناسیونالیسمی ـ کە یەکێکە لە دروشمەکانی کۆمۆنیسم ـ ڕۆڵی هەبووە لە بە نێونەتەوەیی بوونی وشە و بابەتی شیعرەکانی. بوونی ژمارەیەکی زۆری وشە و زاراوەی دەستەی دووەم لە ئەنجامی ئەم ئاراستەیە یە.

مەبەستی بەکارهێنانی ئەم وشانە لە شیعردا هەر چییەک بێت (ڕامیاری، فەرهەنگی،...) ڕەنگ و ڕوویەکی تر بە ڕوخسار و زمانی شیعری کوردی دەبەخشێت. شایانی گوتنە کە گۆران بۆ زۆربەی هەرە زۆری ئەم وشانەش مانا و ڕوونکردنەوەی پێویست لە پەراوێزی شیعرەکانیدا دەخاتە ڕوو، بۆ ئەوەی لە کاتی خوێندنی شیعرەکانیدا هیچ تارمایی و نادیارییەک بەرەوڕووی خوێنەر نەبێتەوە. دیارە هەروەک چۆن ئایدیۆلۆژیی گۆران وای لێدەکات لە لایەک ژمارەی وشە و زاراوەی فارسی و عەرەبی لە شیعرەکانیدا بگەیەنێتە کەمترین ئاست؛ بە هەمان شێوە پاڵی پێوە دەنێت کە شیعرەکانی لە کۆمەڵێ وشەی بیانی تر (بە زۆری ڕۆژئاوایی) پڕ بکاتەوە.

## بە کارهێنانی ( onomatopoeia ) و ( interjection )[1]

ئەم دیاردەیە کە شیعری گۆران لە شیعری کلاسیکی کوردی جیا دەکاتەوە، بەکارهێنانی دوو جۆر ئامرازی دەربڕینە (ئامراز، بە واتایەکی گشتی) کە زیاتر شێوازی دەنگیان هەیە. مەبەستمان لێرەدا دەنگێکە کە یا یەکسەر لە سروشتەوە وەرگیراوە (onomatopoeia)، یان ئەو دەنگەی کە لە ناخی شاعیرەوە سەرچاوە دەگرێت (interjection). یەکەمیان واتا (onomatopoeia) لاسایی دەنگی شتێک یان بوونەوەرێکی سروشتە (مرۆڤ نەبێت) و لە لایەن زماناسانەوە بە وشە دادەنرێت. لەبەر ئەوەی شێوازی دەربڕینیان (prononciation)،

(١) لە بەر نەبوونی وشەی کوردی بەرامبەریان، پێمان باشتر بوو وشەکان وەکوو خۆیان و بە بێ وەرگێڕان بە کار بێنین.

ڕێنووسیان، فۆرمی ڕێزمانییان و واتایان دیاره[1]. بەڵام (interjection) دەنگێکە بۆ دەربڕین لە ناخی شاعیرەوە و لە ناو سیاقی ڕستەدا مانای هەیە.

:(onomatopoeia)

(نەورۆز، ل **٣٠٩**)

پووش بوو بە گیا، چیلکەی باخ بوو بە دار گوڵ،
لە وشکەسی کانی کەوتە قوڵە ـ قوڵ.

(گۆرانی کەو، ل **٤٢٤**)

قەقبە، قەقبە، قەقبە، قەق!
شاخی بەرز و بەردی ڕەق،
جێگای چێڕە و جێگای بەق
قەقبە، قەقبە، قەقبە، قەق!

:(interjection)

(هەڵبەستی ڕەنجاو، ل **٣٧**)

کەی تۆم دیوە؟ کەی ئەتناسم؟ کەی؟ کەی؟ کەی؟
دڵداری چی؟ پەیمانی چی؟ حەی! حەی! حەی!

(گەشت لە قەرەداغ، ل **١٣٥**)

هەر چۆک دادان بوو هەڵسانەوەو (هەی!)
سۆزی هاواری ناکا «وەی، وەی، وەی»

(ئاخ، هەزار ئاخ...، ل **١٨٥**)

ئۆف، هەزار ئۆف ! ئاخ، هەزار ئاخ ! تا قیامەت ئاخ و داخ!
من کە سنگم بەردە، طەبعم بەرزە چەشنی شاخ و داخ؛

---

(1) DUPRIEZ, Bernard, *Gradus, Les procédés littéraires (dictionnaire)*, Paris, 10/18, 1984. pp. 316-317.

فەلسەفەی بە کارهێنانی ئەم ئامرازانە لە لای گۆران دەبێ چی بێت؟ بە ڕای ئێمە بەکارهێنانی ئەم کەرەستانە لەگەڵ تایبەتمەندییەکانی تری شیعری گۆراندا کە تا ئێستا بینیومانە، هەماهەنگە. بینیمان چۆن گۆران بۆ کێش و سەروا و وشە و زاراوەی شیعری خۆی سوود لە تایبەتمەندییەکانی شیعری فۆلکلۆری وەردەگرێت بۆ ئەوەی ژمارەیەکی هەرە زۆری خوێنەر لە دەوری شیعرەکانی خۆی کۆ بکاتەوە. جا ئەم کەرەستانەش لە شیعری فۆلکلۆریی کوردیدا کەم نین و پێدەچێت شاعیر لە بەکارهێنانیاندا دیسانەوە لە ژێر کاریگەریی شیعری فۆلکلۆری بووبێت. شیعری گۆران بەم ئامرازانەوە ڕەنگی زمانی شیعری تایبەت بە گەل بە خۆیەوە دەگرێت و زمانەکەی لە ئاستی زمانی قسەی ڕۆژانەی خەڵک نزیک دەبێتەوە و هەستی خۆیی بوون لای خوێنەر دروست دەبێت و وادەکات خوینەر زیاتر لە شیعرەکانی نزیک ببێتەوە.

## سیستەمی ڕستەسازیی سادە و دوورە پەرێزی لە تارمایی واتایی

سادەیی ڕستەسازی یەکێک لە خاڵە سەرنجڕاکێشەکانی شیعری گۆرانە. بۆ شاعیری کلاسیک زۆر ئاسایی بوو ئەگەر بە هەر هۆیەک بێت (پێویستی کێش یان بەکارهێنانی هونەرەکانی واتاناسی «علم المعانی» )، یاری بە کەرەستەکانی ڕستەی شیعری بکات و لە شوێنی ئاساییان لە ناو ڕستەدا بیان جووڵێنێت و پێڕەوی لە یاساکانی ڕێکخستنی ئاسایی کەرەستەکانی ڕستەی زمانی کوردی نەکات. تێکدانی پێوەندیی نێوان کەرەستەکانی ڕستەی شیعری فاکتەرێکی بەهێز بوو بۆ ئەوەی جۆرە تارماییەک لە واتای شیعرەکەدا لای خوێنەر دروست ببێت. ئێستاش زۆرجار پەیداکردنی پێوەندییە ڕێزمانییەکانی نێوان ئەم کەرەستانە لە شیعری کلاسیکدا پێویستیی بە خوێندنەوەیەکی ورد دەکات. ئەمە یەکێک لەو هۆکارانە بوو کە وای دەکرد شیعری کلاسیک خوێنەری تایبەتی خۆی هەبێت.

گوتمان کە هونەری شیعری گۆران ل دوا قۆناغیدا بە ڕێبازی ڕیالیزمی سۆسیالیستییەوە ئاراستە دەکرێت. گۆران خۆی بە شاعیری

گەل دادەنێت و چاک دەزانێت کە ئەگەر شاعیر بیەوێت شیعرەکانی لە ناو گەلدا دەست بە دەست بگەڕێن، دەبێت زمانێک بۆ گوتارە شیعرییەکەی هەڵبژێرێت کە لە زمانی گەل و لە ئاستی تێگەیشتنییەوە نزیک بێت. ڕەوانیی زمان و سادەیی شێوازی نووسین مەرجە بۆ تێگەیشتنی ئاسانی شیعرەکان لای خوێنەر. کەچی تێکدانی سیستەمی ئاسایی ڕێکخستنی کەرەستەکانی ڕستەی شیعری یا خود تارمایی زمانی زیان بەم ئامانجە دەگەیەنێت و تێگەیشتنی یەکسەر و تەواوی گوتاری شیعری بۆ هەموو جۆرە خوێنەرێک مسۆگەر نابێت. بۆیە جێگۆرکێی کەرەستە زمانییەکان لە شیعری گۆراندا لە چاو شیعری کلاسیک دەگاتە کەمترین ئاستی خۆی و لەم ڕووەشەوە زمانی شیعری گۆران وەکوو زمانی شیعری فۆلکلۆریی کوردی لە شێوازی سادەی زمانی ڕۆژانەی خەڵک نزیک دەبێتەوە.

## لێکچواندن، باوترین وێنەی شیعری

هەروەکوو شاعیرانی کلاسیکی فارس و عەرەب، شاعیرە کلاسیکە کوردەکان بە گوێرەی پێویستیی شیعرەکەیان و زەوقی شاعیریی خۆیان، وێنە ڕەوانبێژییەکانی مەجاز، خوازە (استعارە)، لێکچواندن (تشبیە) و درکە (کنایە)یان بە کار دەهێنا. خوازە و درکە لە وێنە بەهێزەکانی شیعر بوون و نیشانەی شارەزایی شاعیر و هۆی بەرزیی ئاستی شیعرەکەی بوون. کە چی زۆر جار لێکچواندن نیشانەی شاعیری کەم توانا بوو. هەرچی ژمارەی مەجاز و بەتایبەتی خوازە و درکە لە شیعردا زیاتر بوایە، تێگەیشتنی شیعرەکە تەقەلا و وردبوونەوەیەکی زیاتری لە لای خوێنەر دەویست. چونکە شاعیر بە بەکارهێنانی وشەیەکی تر ـ واتا نیشانکەر (دال) ـ لە جیاتی ئەو وشەیەی مەبەستێتی ـ واتا نیشانکراو (مدلول) ـ، بە جۆرێک لە جۆرەکان ماناکان دەشارێتەوە و لە سەر خوێنەرە کە بە پێی نیشانکەر، نیشانکراوە شاراوەکان بدۆزێتەوە. کەچی لە لێکچواندنی ئاساییدا پێوەندیی نێوان وشەکان نەک لە سەر بنەمای نیشانکەر و

نیشانکراو، بەڵکوو لە سەر بنیاتی لێچوو (مشبە) و لەوچوو (مشبە بە) ڕێک دەخرێن و لە شیعرەکەدا دیارن و هیچکامیان شوێنی ئەوی تر ناگرێتەوە.

با بزانین خودی گۆران لەم بارەیەوە چۆن شیعری کۆن و نوێ (ڕیالیستی) لە یەکتر جیا دەکاتەوە:

**لە هەڵبەستی کۆنا نرخی وێنە لە پێش نرخی ناوەڕۆک (محتوی)دا دێ لە بەر ئەوە نیشانەی وشەبازی لە هەڵبەستی کۆنا زەق ئەکەوێتەوە بەر چاو ـ جیناس، لەف و نەشر،... تاد، بەڵام لە هەڵبەستی تازەدا بە تایبەتی لە هی قوتابخانەی ریالیزمی تازەدا وشەبازی و زەڕکەشی کردنی ئوسلوب باوی نەماوە لەباتی ئەوەی لەنگەری بایەخ پێدان خراوەتە سەر ناوەڕۆک**[1].

هەر بۆیەش لە شیعری گۆراندا بایەخێکی تایبەت بە لێکچواندن دراوە. لێکچواندن وەکوو وێنەیەکی ڕەوانبێژی، لە شیعرە تازەکانیدا لە چاو شیعرە کۆنەکانی شوێنێکی تایبەتی هەیە. بێگومان ئەمەش لە سەر حسابی وێنەکانی تر واتا مەجاز و خوازە و درکە بووە. هەرچەند ژمارەی لێکچواندن لە شیعرەکانیدا زیاد دەبێت ئەوەندە لە ژمارە و بایەخی وێنەکانی تر کەمتر دەبێتەوە.

**(وەڵامی پرسیار، ل ٢٢١)**

ڕاکشابووم لە سەر پشتم،
دکتۆرەکەم
ماری شێرپەنجەی ئەکوشتم...

ناڵێم وەک دایکێکی دڵسۆز
فرمێسکی بۆ هەڵ ئەڕشتم،
بەڵام، تەواو وەک کچی خۆم،
دەستی ئەخستە ناو مشتم،
بە چاوی پڕ لە هەستی جوان
ئەیکرد تەماشای سروشتم،

---

(١) ئاشنا، ع، (٢٠٠٢)، ل ٢٨-٢٩.

ئەیپرسی لێم: بۆچ وا ماتی؟
بۆچ هەمیشە خەمبار دیاری؟
بۆ من ئەم پرسە وەک هەنگوێن
ئەتکایە سەر لێو لە زاری
بەڵام بۆ خوشکانی بەردەست
سیس کردنی گوڵ بوو کاری...
دوو سێ کچ بوون وەک دوکتۆر خۆی،
خەمخواری یان لێ ئەباری،
نەک هەر بۆ تیماری دەردم،
بۆ چارەش بۆ باغچەی زەردم!

* * *

بەڵێ، دکتۆر! خوشکان! ماتم،
هەر من نیم (مات)ی وڵاتم،
لە ناو هەزارانا: تاک تاک
لێومان هەیە پێ بکەنێ
لای ئێمە بۆ دنیای شادی
وا تازە خەڵک هەنگاو دەنێ!

لە نموونەی سەرەوەدا پێنج لێکچواندن هەیە کە بریتین لە:

دوکتۆر وەک دایکێکی دلسۆز
دوکتۆر وەک کچی خۆم

ماری شێرپەنجەی (شێرپەنجە وەکوو مار، لە شیعرەکەدا ئامرازی لێکچواندن ــ وەکوو ــ لابراوە)

پرسە وەکوو هەنگوێن
دوو سێ کچ وەکوو دوکتۆر خۆی

دوو مەجازی شیعرەکە بریتین لە:
باخچەی زەرد : غەم و پەژارە

لێو: کەس، مرۆڤ

تەنیا یەک خوازە لەم شیعرەدا دەبینرێت:

خەمخواریان لێ ئەباری: لێیان دیار بوو (فرمانی ئەباری کە بۆ باران بە کار دێت بۆ غەمخواری بە کارهێنراوە).

تاکە درکەی شیعرەکەش بریتیە لە:

سیس کردنی گوڵ بوو کاری: وەکوو گوڵ سیسی دەکردن: بێزاری دەکردن. ڕەفتاری لە گەڵیان خراپ بوو.

دیارە بایەخدانی زیاتر بە لێکچواندن بەو واتایە نییە کە وێنەکانی تر لە ناو شێعری گۆراندا ئیتر جێگایان نابێتەوە. بەڵام لە چڕیی ئەم وێنانە لە شیعردا کە دەبنە هۆی ئاڵۆزیی واتای شیعری، کەم دەبێتەوە. لێرەشدا دیسان شیعری گۆران لە شیعری سەرزارەکیی گەل واتا شیعری فۆلکلۆریی کوردی نزیک دەبێتەوە. چونکە هەروەکوو لە سەرەتای ئەم بەشەدا ئاماژەمان پێ دا، لێکچواندن باوترین وێنەی شیعرییە لە شیعری فۆلکلۆریی کوردیدا. هەندێ جار شاعیر لە لێکچواندندا ئامرازی لێکچواندن لادەبات. بەڵام دۆزینەوەی پێوەندیی نێوان لێچوو و لەوچوو لەم جۆرە لێکچواندنانەدا لە شیعری گۆراندا کارێکی زۆر سەخت نییە. وەکوو لە نموونەی خوارەوەدا کە وێنە هەرە دیارەکانی بریتین لە لێکچواندن و ئێمە لە بەر درێژیی شیعرەکە، تەنیا بەشێکی لێ دەخەینە ڕوو:

(**ئاخ، هەزار ئاخ...، ل ١٨٥**)

ئۆف، هەزار ئۆف! ئاخ، هەزار ئاخ! تا قیامەت ئاخ و داخ!

من کە سنگم بەردە، طەبعم بەرزە چەشنی شاخ و داخ؛ [سنگم وەکوو بەردە]

من کە خوێنم ئاگرە، [خوێنم وەکوو ئاگرە]

چوونەجۆشم حازرە،

من کە مایەی فەخری تەئریخی بەرووم

تاقە ڕەنگی ئابرووم
مەردی، بی باکی، دلێری بوو هەموو...
کوا؟ مەگەر ئەصلی نەبوو؟
بۆ سەرم نەرمە لە عاستی بەندی دیلی، داخەکەم؟.
بۆ لە نزمی و پەستی یا وەک گۆمی لووطە شاخەکەم؟
.......

بەکارهێنانی ڕەمز لە شیعری گۆراندا، لە خۆیدا دیاردەیەکی تازە نییە. چونکە پێش ئەویش لە شیعری کوردیدا ڕەمز جێگایەکی دیاری هەبووە. بەڵام ئەم ڕەمزانە لە بەر باوی و زۆریی بەکارهێنان وردە وردە بوونەتە ڕەمزی گشتی (وەکوو ڕەمزی مەی لە شیعری کلاسیکی سووفیدا) و نیشانکراوەکانیان ناسراون. ڕەمز وێنەیەکی زۆر باوی شیعری گۆران نییە. چونکە وەکوو گوتمان، گۆران لە شیعرەکانیدا بە کارهێنانی ئەو وێنانەی کە دەبنە هۆی ئاڵۆزی یا شاراوەیی واتا، کەم دەکاتەوە. لە گەڵ ئەوەشدا ڕەمز لە هەندێ لە شیعرە ڕامیارییەکانیدا بایەخی پێ دراوە و ئەمەش هۆکاری تایبەتی خۆی هەیە. گۆران هەر واش ئەوەندە تووشی ستەم و مەینەتی هاتووە کە ئیتر نایەوێت بە هێنانەوەی ناوی ئەو کەسایەتییە ڕامیارییانەی ڕەخنەیان لێ دەگرێت، توشی ئازار و ئەشکەنجەی زیاتر ببێت. لەگەڵ ئەوەشدا نایەوێت واز لە ڕەخنەگرتن و ریسواکردنی زۆردارانی ناوخۆ و سەروەرەکانیان بهێنێت. ناچار پەنا دەباتە بەر ڕەمز و بۆ هەر کەسایەتییەک ڕەمزێک هەڵدەبژێرێت. لە شیعرێکدا کە لە ساڵی **١٩٥٣** دا ئاراستەی نووری سەعیدی سەرۆک وەزیرانی سەردەمی فەیسەلی دووەمی پاشای عێراقی کردووە، گۆران لە هێما نەتەوەیییەکانی ئەدەبی فۆلکلۆریی کوردی سوود وەردەگرێت:

(**زیندانی ئەژدەهاک، ل ٢٦٨**)

ئەژدەهاک! زیندانت قەڵا ـ قەڵایە؛
دیواری کۆنکرێت، دەرگای پۆڵایە.
....
ئەژدەهاک! ئەی دێوی لە (بیر) زراو چوو،
ئەی ناشتای مارانت بە مێشک کردوو!
....
هەر ئەگری، ئەکوژی، ئەدەی لە گەردن،
مێشک دەرخوارد ئەدەی بە ماری نەوسەن...
.....

لە ژێر ناوی شیعرەکە شاعیر ئاماژە بەوە دەکات کە شیعرەکەی «بۆ بتەکانی فاشیزم» تۆمار کردووە. گۆران وێنەی ئەژدەهاکی بۆ نووری سەعید بە کار هێناوە و مارەکانیش هێمای وڵاتە ئیمپریالیستەکانن کە نووری سەعید هەردەم لە خزمەتیاندایە و بە کەیفی خۆیان یاری بە سامانی وڵات دەکەن. کاوەش کە وینەیەکی تری دیاری ئەم شیعرەیە هێمای ئەو شۆڕشگێڕانەیە کە لە بەرامبەر زوڵم و زۆرداری سەر نانەوێنن و زنجیری دیلە بەندکراوەکان دەشکێنن و موژدەدەری ڕزگاری و ئازادیی وڵاتن. داستانی فۆلکلۆریی ئەژدەهاک و کاوەی ئاسنگەر شوێنێکی تایبەتی لە شیعری گۆراندا داگیر کردووە. ئەم داستانە بووەتە بابەتی ئۆپەرایەکی گۆران بە ناوی (ئەنجامی ئەژدەهاک، ل**٣٥٢**). هەر ئەو وێنانە جارێکی دیکە بە شێوەیەکی ڕەمزی لە شیعری (نەورۆز، ل**٣٠٩**) دا دووبارە دەبنەوە. لە شیعری (چەقەڵ، ل **٣٩٠**) دا کە لە ساڵی **١٩٥٤** دا نووسراوە، شاعیر ئەمجارە وێنەی چەقەڵی پیر بۆ نووری سەعید بە کار دێنێت و لە بەرامبەریدا وێنەی کەڵەشێر بۆ مرۆڤی خەباتکار[1]. کاتی ئێستای فرمانە

---

(١) شارەزا، ک، « گۆران و بە کار هێنانی نوێی ڕەمزەکانی نەورۆز» لە *پاشکۆی کاروان*، ژ ١٨، هەولێر، ڕۆشنبیری و لاوان، **١٩٨٤**، ل **٢٠-٢٦**.

بەکارهاتووەکانیش (هەر ئەگری، ئەکوژی، ئەدەی لە گەردەن،...) گوزارشت لەو ڕاستییە دەکات کە هێماکان ئاماژە بە کەسایەتییەکی سەردەم دەکەن. لە شیعری (لاوک و پەیام، ل **٢٣٦**) دا شاعیر سەرەتا دێڕێکی شیعری فۆلکلۆریی کوردی لە لای چەپی سەرووی لاپەڕەکە دەخاتە ڕوو و لە ژێریشەوە لە ناو دوو کەوانەدا ئاماژە بە سەرچاوەی دێڕەکە دەکات :

« گولاڵە برایمە.. گری .. گری»

« چووینە غەزای ناو گاوری»

**(فۆلکلۆری کوردی)**

ئینجا دێڕی یەکەمی شیعرەکەی بەم شێوەیە دەست پێ دەکات:

ئازادیخواز! گری ..گری..

کەوتە ژێر پێی درنج، پەری:

....

لەم شیعرە ڕامیارییەدا کە هەر لە سەرەتاکەیەوە شاعیر بە ئەنقەست پیشان دەدات تا چ ڕادە لە ژێر کاریگەریی شیعری فۆلکلۆریی کوردیدا بووە و ئیلهامی لێ وەرگرتووە، درنج و پەری بوونەتە هێمای ولاتە داگیرکەرە ئەمپریالیستەکان. شێوازی بە کارهێنانی ئەم ڕەمزانە بۆ سەردەمی گۆران شێوازێکی تازەیە[1]. بەلام دەبێ ئەوەش بڵێین کە ئەم هێمایانە بە هێچ شێوەیەک بە مەبەستی داهێنانی شیعری سەمبۆلیست (بە واتای تایبەتی وشە، وەکوو لە شیعری فەڕەنسی نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەمدا سەری هەڵدا و لە زۆربەی ولاتانی ئەورووپیدا پەرەی سەند[2]) بە کار نە هاتوون و

---

(١) سەرچاوەی پێشوو.

(٢) بە کارهێنانی ئەم ڕەمزانە لە شیعری فەڕەنسیشدا بە کارهێنانێکی کلاسیک و کۆنە و symbole لە شیعری فەڕەنسی کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم بە تەواوی چەمک و پێناسە و واتایەکی تر دەگرێتەوە خۆی. بڕوانە:

FISER, E., *Le Symbole littéraire*, Paris, Rien De Commun, s.d.

بەشداری لە بەدی هێنانی شیعری لەم جۆرە دا ناکەن. بەڵکوو ئامرازن بۆ خۆدزینـەوە لـە ڕاشکاوی و ڕاستـەوخۆیی پـەیامی شـیعری. گـۆران ئەوەندە بە ڕەوانیـی گوتـارە شـیعرییەکەی بەنـدە کـە کـەمی ڕادەی بـە کارهێنانی ڕەمز لە شیعرەکانیدا دەکرێ بـە لامانـەوە سەلمێـنەری ئـەو ڕاسـتییە بێـت کـە ئەگـەر مەترسـی و گـیران و ئەشـکەنجەدان نەبوایـە، لەوانە بـوو هـەر ئـەم ژمـارە کەمـەش لـە شـیعرەکانیدا نەبینرێت. ئـەم هێمایانەش (کـاوە، ئـەژدەهاک، مـار، چـەقەڵ، کەڵەشێر، دێـو و دڕنـج، پەری...) ئەوەندە ناسراون و شوێنی بەکارهێنانیان لە شیعری گۆرانـدا ئەوەندە ڕاشکاوانەیە کە دۆزینەوەی نیشانکراوەکانیان پێویسـتیی بـە خۆماندووکردنێکی ئەوتۆ ناکات.

لێکۆڵینەوەی نوێکردنەوەی شیعری کوردی لای گـۆران، پلـە وپایـەی سامانی فۆلکلۆریمان لە لای ئەم شاعیرە گەورەیە بـۆ دەرخست. جگـە لـــەو بەڵگانـــەی لـــە نـــاوەوەی باســـەکەماندا لـــە کـــاتی توێـــژینەوەی ڕوخساری شیعرەکانیدا خستمانە ڕوو، بەڵگە و نیشانەی زۆری تـریش هـــەن کـــە ڕادەی بایـــەخ و خۆشەویســـتیی گـــۆران بـــۆ فەرهـــەنگ و کەلـەپووری کـوردی بـە گشـتی و بـۆ ئـەدەبی فۆلکلـۆریی کـوردی بـە تایبەتی پیشان دەدەن. بە ڕای ئێمە ناوچەی هەورامان بە تایبەتمەندییـە کولتوورییەکانییەوە ڕۆڵی سەرەکیی لەم بوارەدا گێڕاوە. لە سەرەتای باســـەکەماندا ئاماژەمـــان بـــەوە کـــرد کـــە ناوچـــەی زاراوەی گـــۆرانی (هەورامان) یەکێک لەو ناوچانەی کوردستانە کە دانیشتووانی لـە چـاو دانیشـتووانی ناوچـەکانی تـری کوردسـتان باشـتر توانیویانـە سـامانە کولتوورییـە ڕەسـەنەکانیان بپارێـزن و لـە شـیعرەکانیاندا سـوودی لـێ ببینن. تۆ بڵێی هەڵبژاردنی نازناوی **گۆران** لـە لایـەن ڕەشـید نەجیبـەوە بۆ ئەم شاعیرە، بەبێ هۆ بووبێت و پێوەندیی بە دڕک پێکردنی ڕەشـید

نـەجیب بـە خۆشەویسـتیی شـاعیر بـۆ ئـەو ناوچـەیە و تایبەتمەندییـە کولتوورییەکانی نەبووبێت؟ لە بیری نەکەین کە شوێـنی لـە دایکبـوون و ژیـانی منداڵێـتی شـاعیر واتـە هەڵەبجـە لـە تەنیشـت هەورامانـە و شیعری (گەشت لە هەورامان، ل **١٢٧**) لە خۆیدا گوزارشتێکە لـە هەسـت و نەستی شاعیر بەرامبەر بە دیمەنە خەوناوییەکانی ناوچـەکە. خـودی شاعیر لە سەرەتای شیعرەکەدا دەڵێت:

**ئەم گەشتنامەیە کە سەردەمی هەڵبەستی ئەگەڕێتەوە بۆ بیسـت ساڵێـک لەمـەو پێش، لە هەڵەبجەوە دەست پێ ئەکا. مایەی ئینطیباعـاتی تاقـە گەشتێـک نی یـە، بەڵکو هەست و بینینی چەن گەشتێکی کات و وەرزی جیاجیای پێشوو لە بیرەوەریما پەنگیان خواردەوە، هەتا بۆ جاری دوایی لەگەڵ چەن هاوڕێ یەکی گیانی، بـۆ چـەن ڕۆژێک، بە پێکەنین و گۆرانی وتن بە ناو باخە زۆرەکان و یاڵە بەرزەکانی هەورامانا سووڕاینەوە. ئیتر ئەم هەڵبەستە لە خوڵاصەی هەموو ئینطیباعاتی گەشتەکانی کۆن و تازەم هاتە دی.**

لە میانەی باسەکەماندا سەلماندمان کـە تایبەتمەندییـەکانی شـیعری گۆرانی فۆلکلۆریی کـوردی سەرچـاوەی سـەرەکیی بـەهرەی شـاعیریی گـۆرانن. لەوانەیـە بـە لای گۆرانـەوە فاکتـەرە ڕوخسـارییەکانی هـیچ شیعرێک بە قەدەر هی شـیعری گـۆرانی (سـترانی) سـەرزارەکی کـوردی بۆ شیعرەکانی گونجاوتر نەبووبن. گرنگیدانیشی بە شیعری شـاعیرانی کلاسـیکی شێـوەزار گـۆرانی بـە تایبـەتی مەولـەوی هـەر لـە بـەر ئـەوە بـووە کـە ئـەم شـیعرە لـە ڕووی کێـش و سـەرواوە مـۆرکی شـیعری فۆلکلـۆریی کـوردیی پێـوە دیـارە. شـایانی باسـە کـە گـۆران سـروود نووسـیش بـووە و بەشێـکی تایبـەتی شـیعرەکانی خـۆی لـە ژێـر نـاوی سروود ڕێکخستووە. سروود شیعرێکی نیشتمانییە کە وەکـوو گـۆرانی ئاوازی بـۆ دادەنرێت. تـا ئێسـتاش سـێ لـەم سـروودانە کـە بـریتین لـە

(کوردستان، ل **٤٠١**)، (بەری بەیانە، ل **٤٠٢**) و (دەمی ڕاپەڕینە، ل**٤٠٣**) ئاوازییان بۆ دانراوە و کراون بە گۆرانی[(١)]. هەروەها دوو لەو شیعرانەی بۆ منداڵانی نووسیوە، ناوی **گۆرانی** بە خۆیانەوە دەگرن کە بریتین لە (گۆرانی کەو، ل**٤٢٤**) و (گۆرانی دەنکە گەنم، ل**٤٢٧**). تۆ بڵێی گۆران نەیویستبێت شیعرەکانی خۆی، بە تایبەتی شیعرە نیشتمانی، نەتەوایەتی و ڕامیارییەکانی خۆی بە شێوەی گۆرانییە فۆلکلۆرییەکان بخاتە سەر زمانان؟

---

(١) سەرکار، خ، *سروودی کوردی*، سلێمانی، ئینستیتوتی کەلەپوری کوردی، **٢٠٠٥**، ل **٣٣،٣٥**، ١٠٧.

# بەشی سێیەم

## پرسێکی هونەری یان ئایدیۆلۆژی؟

**مۆسیقای شیعری**

**زمانی شیعری**

- **وشەگەلی شیعری**
- **دوو پێناسەی جیاواز بۆ « شیعری جەماوەر»**

## نوێکردنەوە: دابڕان لە چی؟

شیکردنەوەی پرۆسەی نوێکردنەوەی شیعریی نیما و گۆران لە ڕووی ڕوخسارەوە لە دوو بەشی پێشوودا ئێستا ئەو دەرفەتەمان پێ دەبەخشێت کە بەراوردی هونەری شیعری ئەم دووشاعیرە ناوداره بکەین. ئەم بەراوردە ڕێگەمان پێ دەدات فاکتەرە هاوبەش و هاودژەکانی هەر دوو پرۆسەکە لێک بدەینەوە بۆ ئەوەی بتوانین وەڵامی پرسیاری باسەکەمانی لێ وەدەربێنین.

# پرسێكی هونەری یان ئایدیۆلۆژی؟

## مۆسیقای شیعری

نوێكردنەوی شیعری كوردی و فارسی لە ئەنجامی ئەو شەپۆلەی مۆدێرنیزم هاتەكایەوە كە لە سەرەتاكانی سەدەی بیستەمەوە ولاتانی ناوچەكەی گرتبووە بەر شالاوی خۆی و هاوكات بوو لەگەڵ كۆمەڵێ گۆڕانكاریی رامیاری و كۆمەلایەتی كە رێگایان بۆ گۆڕانكارییە فەرهەنگییەكانیش خۆش دەكرد. لە بواری شیعردا نیما و گۆران یەكەم كەس نەبوون كە بەشدارییان لەو شەپۆلەدا كرد. بەڵكوو ئەوان برەوێكی تازەیان پێ بەخشی و خستیانە قالبێكی هەمەلایەنە و رێكخستوو. سەرەتا و بناغەی كاری هەردووكیان شیعری كلاسیكی بوو كە بووبووە گۆڕەپانی ئەو ئەزموونە شیعرییە نوێیانەی لە ئاشنایەتیی شاعیران لەگەڵ شیعری تازەی ولاتانی دراوسێ و رۆژئاوادا سەرچاوەیان وەردەگرت. نیما خوێنەرێكی ماندوونەناسی شیعری مۆدێرنی فەرەنسی بوو و گۆرانیش دانی بەوەنا كە لەژێر كاریگەریی شیعری توركیدا بوو ــ كە بەش بە حاڵی خۆیان لە ژێر كاریگەریی شاعیرە فەرەنسییەكاندا بوون ــ. بێگومان شارەزاییان لە بواری شیعری بیانیدا رۆڵێكی سەرەكیی لە دابڕانیان لەگەڵ نەریتە كۆنەكاندا گێڕا. لە سەرەتادا تێكدانێكی لاوەكیی شێوە كۆنەكان وەكوو جۆرێك لە جۆرەكانی لادان لە زەبری یاسا كۆنەكان لای هەردووكیان كاری پێ دەكرا؛ جا بە زیادكردنی چەند دێڕێك بە قەوارەی ئستانداردی بەندەكانی شیعرەكە بێت، یان بە یاریكردن بە سەرواكانەوە، تاد.

بە درێژایی نوێکردنەوەیان و لە چەند قۆناغێکدا بە گشتی ڕەوایی و سوودی یاسا کلاسیکەکان خرایە ژێر چەند پرسیاری ڕادیکاڵەوە. بەش بەحاڵی خۆی نیما شیعری لە یاسای یەکێتی قەبارەی دێڕەکان ڕزگار کرد. سیستەمێکی تازەی سەرواسازیی داهێنا کە بایەخی زیاتری بە ڕۆڵی سێمانتیکی سەروا دەدا. تیۆری مۆسیقای شیعری نیما بە گشتی لەم دوو خاڵە سەرەکییەدا خۆی دەنوێنێت. لای گۆران لە سەرەتادا هەڵسوکەوتێکی تا ڕادەیەک هاوشێوە لەگەڵ کێش و سەروادا دەبینرێت. بەڵام لەمەڕ هۆکارەکانی ئەم هەڵسوکەوتە شتێکی ئەوتۆمان ناخاتە بەردەست و تۆ بڵێی هێشتا لە قۆناغی تاقیکردنەوەدایە، کاتێ بە یەکجاری واز لە کێشی عەرووز دێنێت و ڕوو لە کێشی شیعری فۆلکلۆریی کوردی دەکات و داهێنانیشی تێدا دەکات و پەرەی پێ دەدات. کێشی بڕگەیی بۆ نیما کێشێکی نەناسراو نەبووە و ناسینەکەشی تەنیا لە ڕێگای خوێندنەوەی شیعری فەرەنسییەوە نەبووە. کەچی لە کۆی بەرهەمە شیعرییەکەی سێ نموونەی شیعری منداڵانی لێ دەربچێت، کێشی بڕگەیی بایەخێکی ئەوتۆی نییە. ئەم جیاوازییە لە نێوان دوو شاعیردا شایانی ئەوەیە هەندێ لە سەری بوەستین.

اخوان **ثالث** لە بەرهەمەکەیدا *بدعتها و بدایع نیما یوشیج* (داهێنان و جوانکارییەکانی نیما یوشیج) باس لەو فاکتەرانە دەکات کە پێ دەچێت لە بواری ئازادکردنی کێشی شیعردا ئیلهامدەری نیما بووبن. یەکێک لەو فاکتەرانە بەلایەوە بریتییە لە گاتاکان کە بەشێکن لە سرووده ئایینییەکانی ئاڤێستای زەردەشت. ئەمە بە پشت بەستن بە وتەیەکی خودی نیما کە دەڵێت:

**لە کایەی عەرووزی مندا یەک نیوەدێڕ یان دو نیوەدێڕ چەندیش ڕێکخراو بن، جگە لە کێشێکی ناتەواو هیچی تر نین. چەند نیوەدێڕێکی یەک لە دوای یەک بە هاوبەشیی یەکتر کێشی ویستوو دێننە کایەوە. بە هەمان شێوە کە ئاماژەم پێ دا. من**

**پێوەندییە مادی و بینراوەکانم لە بەر چـاو گرتـووە و لــە "گاتاکـان" کـە فرمـانی ڕەسەنمانن و خاوەنی ڕەسەنایەتی کێشن لە شیعرەکەماندا، دەستم پێ کردووە**[1].

بە ڕای ثالث ئەمـە بەڵگـەی ئـەو ڕاسـتییەیە کـە شـیعری ئێـرانی پێـش ئیسلام و لەوانەش شیعرەکانی ئاڤێستا (گاتاکان) یەکێک لـە سەرچـاوە ئیلهامـدەرەکانی نیمـا بـووە لـە نوێکرنەکەیدا. وتەکـەی نیمـا تاقانـە پاڵپشـتی ئـەم بیرۆکەیـەی ثالـــث نییـە. هۆکـاری تـریش هــەن کـە بـۆ خستنەڕووی ئەم ڕایە پاڵی پێوە دەنێن. ئەمە کاتێ بۆمان دیـار دەبێـت کـە ثالث لـە بـەردەوامی قسـەکانیدا ئامـاژە بـە وتەیـەکی صادق هـدایت گەورە پەخشاننووسـی ئێـرانی و دۆسـتی نیمـا[2] دەکـات کـە لـە بـارەی تێکستەکانی ئاڤێستا دەڵێت:

**زۆربەی شیعری ئاڤێستا یەک کێش و ڕیتمی دیاری نییــە. واتــە ئاهــەنگی هــەر دێڕێک لەوانەیە لە هی دێڕێکی تر جیاواز بێت... نیوەدێڕی یەکەم شەش بڕگەیی[یە] هی دووەم حەوت، هی سێیەم هەشت و هی چوارەم حەوت بڕگەیان هەیە**[3]...

ثالـــث بـەم شێـوەیە پیشـان دەدات کـە خۆیشـی لەگـەڵ هـدایت دا هاوڕایە. لە لایەکی ترەوە ژمارەیەکی زۆری شـاعیرانی ڕەگەزپەرسـتی سـەردەمی نیمـاش لـەو بـاوەڕەدا بـوون کـە کێشـی عـەرووز کێشێکی بیانییە و لە عـەرەبی داگیرکـەرەوە (پاش لەشکەرکێشـییەکانی ئیسـلام بـۆ سـەر ئێـران) هـاتووە و شـیعری کـۆنی فارسـی وەکـوو شـیعری فۆلکلۆریی فارسی بە کێشی بڕگەیی هۆنراوەتـەوە و دەبێ ئـەم کێشـە ببێتە بناغەی ڕیتمی شیعری سەردەم. بۆ ئـەم شـاعیرانە نوێکردنەوەی

---

(۱) یوشـیج، ن، *دربـاره شـعر و شـاعری*، گـردآوری، نسـخه بـرداری و تـدوین سیروس طاهباز،؟، انتشارات دفترهای زمانە، ۱۹۸۹/۱۳٦۸، ص ۳٤٥.

(۲) نیما شیعری خۆی (مانلی) پێشکەش کردووە بـە هـدایت و کـاتێ لـە یـەکێ لـە نامەکانیـدا بـۆ **جنتــی عطـایی** بـاس لـە هـدایت دەکـات بـە یـەکێ لـە دۆسـتە هەرەسـەرکەوتووەکانی خـۆی نـاوی لـێ دەبـات کـە توانیویـەتی خامەکـەی بخاتە خزمەت وڵاتەکەی. بڕوانە: آرین پور، ی، (۱۳۷۹/۲۰۰۰)، ص ٥۹۹.

(۳) أخوان ثالث، م،(۱۳٥۷/۱۹۷۸)، ص ۱٦۱.

شـيعر خـۆی لـە گـۆڕینی ناسـنامەی کێشـی شـیعردا دەنوانـد. لـەو سـەردەمەدا ئـەدەبی سـەرزارەکی لـە ئێـران بووبـووە جێـی بایـەخی کۆمـەڵێ لێکۆڵەری بیـانی. هەنـدێ لـە نووسـەرانیش وەکـوو دهخـدا، هـدایت، کـوهی، شـکورزادە و مـوکری خۆیـان بـە کۆکردنـەوە و لـە چاپدانی بەرهەمی ئەدەبی سەرزارەکی (بە شیعر و پەخشانەوە) کە بـە سامانی نەتەوایەتی دەژمێردرا، خەریک کردبوو. هدایت کە یەکێک لـە شاسوارەکانی نووسینی پەخشانی تازەی هونەری بوو، لە ساڵی **١٩٣١** دا کۆمەڵە شیعرێکی فۆلکلۆریی فارسی بە ناوی *اوسانە* لـە چـاپ دا کـە لە پێشەکییەکەیدا پاڵپشتیی لە پاراسـتنی سـامانی نەتەوایـەتیی ئێـرانی دەکرد. ثالث یەکێک لەو شیعرانە بە نموونە لە کتێبەکەیدا دەخاتـە ڕوو و قـەبارەی جیـاوازی دێـڕەکان و ناوبـەناویی سـەرواکانی بـە کێـش و سەروای نوێی نیما دەچوێنێت. هەر لەو سەردەمەدا و پێش نیمـا یحیـی دولت آبادی کە پێشتر شیعری بـە کێشـی کلاسـیک دەنووسـی، هـەوڵی دا شـیعر بـە کێشـی بڕگـەیی بنووسێـت. ئەمـەش بـە پاڵپشـتی و هانـدانی ئێراننـاسـی ڕۆژئـاوایی ئێـدوارد بـراون بـوو کـە پێـی وابـوو کێشـی سەردەمی پێش ئیسلام دووبارە زیندوو بکرێتەوە و بـەمجۆرە شـیعری فارسی لە ڕووی کێشەوە لە مۆدێلی ئەورووپیش نزیک ببێتەوە[1].

فاکتەرێکی تریش هەیە کە دەکـرا پاڵنەرێکی تـر بێـت بـۆ ڕاکێشـانی نیما بەرەو کێشی بڕگەیی. نیما لـەو ماوەیـەدا کـە لـە آسـتارا مامۆسـتا بـوو، خـەریکی خوێـندنی شـیعری هاوچـەرخی تـورکی بـوو و لـە نامەیەکدا کە ئاراستەی هاشم زادە ناوێکی کـردووە، بـەم شێـوەیە ئـەم ڕاستییەی بۆ باس دەکات:

**بۆ نەهێشتنی ئاسەواری ماندووبوونم لەم بارودۆخە، یەکێ لە سـەرگەرمییەکانم ئەوەیە کە شاعیرە تورکەکان بە تەواوی بناسم. لەوانەیە لە بەر ئـەوە بـێ کـە لـە**

---

(١) أخوان ثالث، م،(**١٩٧٨/١٣٥٧**)، ص ١٦١;

MACHALASKI, F., (1965), *op. cit., pp*. 61-63.

**واری تورکەکاندا دەژیم. بەڵام شیعری باش کە پێیەوە بتوانم هەستەکانم تازە بکەم لە هەر ڕوویەکەوە بۆم نایابە. لە مەڕ ئەم ناوداره ئێرانیانەش کە ئەدەبی فارسییان لە ڕووی بابەتەوە دەوڵەمەند و لە ڕووی نوێکردنەوەوە هەژار کردووە و لەچاو تورکەکان دواکەوتوو دێنەچاو، بە تەواوی بێ سەرنجم**[1].

لە بەشێکی گوتارەکەیدا *ارزش احساسات*، ئاماژە بە کاری هەندێ لە نووسەر و شاعیرە تورکە هاوچەرخەکان وەکوو توفیق فکرت، رجایی زادە، شناسی، احمد ناجی و نامق کمال دەکات و دەڵێت:

یەکێ **لە شاعیران و نووسەرانی تورک « نامق کمال» شاعیر و داستاننووسی ناودارە کە تا ساڵی ١٨٨٨ زیاتر نەژیا و بەرهەمی ژیانێکی نوێی ئەدەبیی لە ئەدەبی زمانی خۆیدا بەجێ هێشت... بە هەمان شێوە کە « گل نهال» و « چوجوق» لە دەقە شانۆگەرییە باشەکانی و «واویلا» نموونەی شیعرە کاریگەرەکانی بە سەبکی تازە بوون.**

**...یەکێکی تر بە ناوی « احمد ناجی»، کە حەزێکی زۆری بۆ وەرگێڕانی شیعرەکانی شاعیری فەرەنسی «سولی پروودوم**[2]**) لەلا بوو، بە دیوانەکانی خۆی (وەکوو «آتش پارە» و «فروزان» و چەندی تر) توانی خۆی بخاتە ناو ڕیزی شاعیرە نوێگەرەکان. هەروەک چۆن « رجایی زادە» و ئەوانی تر _ کە بەش بە حاڵی خۆیان بە وردی کاریان دەکرد _ دروست سەد ساڵ پێش ئێمە دەستیان دابووە هەندێ کاری جیهانی و جیهان پەسەند**[3]....

توفیق فکرت و رجایی زادە دوو دەستپێشخەری نوێکردنەوەی شیعری تورکیی عوسمانیی کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم بوون. نامق کمال کە ئەندامی بزووتنەوەی ئەدەبیی *تنظیمات* بوو بەرپەرچی کێشی عەرووزی عەرەبیی دەدایەوە و بەلایەوە ئەم کێشە بیانی و بێسوود و بەکارهێنانیشی نابەجێ بوو. بە دەستپێشخەرییەکەی خۆی و

---

(١) یوشیج، ن، *نامەهای نیما*، نسخە بردار: شراگیم یوشیج، تهران، موسسە انتشارات نگاە، ١٣٧٦/١٩٩٧، ص ٣٧٦.

(2) Sully Prudhomme.

(٣) یوشیج، ن، (١٣٦٨/١٩٨٩)، ص ٦٠-٦١.

هەوڵەکانی قوتابییەکەی عبدالحق حامد، کێشی بڕگەیی خۆی لە ناو شیعری تورکیدا جێگیر کرد. رجایی زادەش یەکەم کەس بوو کە گۆرانییە میللییە تورکییەکانی هێنایە ناو ئەدەبی تورکیی نووسراو[1].

ئەم دوو ئاماژە دواییەی نیما ئەو ڕاستییەمان بەتەواوی بۆ دەسەلمێنن کە نیما ئاگاداری ئەو هەوڵانە بوو کە لە پێناو جێگیرکردنی کێشی بڕگەیی فۆلکلۆریی تورکی لە جیاتی کێشی عەرووزی عەرەبی لە شیعری تورکیدا لە لای شاعیرە تورکەکان باو بوو. هەروەها لە سەرەتادا بینیمان کە نیما چۆن باسی پلەوپایەی گاتاکان لە ڕووی ڕەسەنایەتیی شیعرییەوە دەکات. بێگومان نیما ئاگاداری ئەو هەنگاوە ڕەگەزپەرستانانەش بوو کە لە پێناو دەرخستنی ڕەگەزە بیانییەکان و بە تایبەتی عەرووزی عەرەبی لە شیعری فارسی ئەو کاتدا دەهاوێژران. سەرەڕای هەموو ئەم فاکتەرانە پێگەی کێشی عەرووز لە شیعری نیمادا پارێزراوە؛ کە چی کێشی بڕگەیی بە تەواوی لە نوێکردنەوە شیعرییەکەیدا نادیارە و شوێنی نییە. وانەبێت کە نیما کێشی بڕگەیی بە یەکجاری فەرامۆش کردبێت. لە بەشی تایبەت بە لێکۆڵینەوەی نوێکردنەوەی کێشی شیعری نیمادا بینیمان کە کێشی بڕگەییش لە شیعریدا جێگەی هەیە، بەڵام ئەم جێگەیە زۆر تەسک و سنووردارە. نیما تەنیا سێ شیعری بەم کێشە هۆنیوەتەوە و هەر سێیانیشی بۆ منداڵان نووسیوە و لە ڕووی هونەرییەوە ناچنە نێو خانەی شیعری نوێی نیما[2]. دیارە نیما بەکارهێنانی ئەم کێشە بۆ جۆرێکی تایبەتی شیعر سنووردار دەکات و بەلایەوە بەکارهێنانی بۆ هەموو جۆرە شیعرێک کارێکی ڕەوا نییە. لە کتێبی *حرفهای همسایه* دا ڕاشکاوانە باس لەو کەسانە دەکات کە بە ناوی نوێکردنەوەی شیعری کێشی بڕگەیی بەکار دێنن و دەڵێت:

---

(١) آژند، ی، *ادبيات نوين تركيه*، تهران، انتشارات امير كبير، ١٩٨٥/١٣٦٤، ص ١١١.

(٢) بڕوانە ل ٤٢-٤٤.

**من لەو باوەڕەدام کە هەر دوو دەستە[ی شاعیران] بە هەڵەدا دەچن: هەم ئەوانەی شیعری بڕگەیی دەنووسن و هەم ئەوانەی شیعری بێ سەروا دەنووسن**[1].

بە پێچەوانەی نیما، گۆران هەر لە یەکەم نووسینەکانییەوە لەبارەی شیعرە تازەکانی، ڕژدە لە سەر لادانی وردەوردەی کێشی عەرووز لە شیعرەکانی و کێشانەوەیان بە کێشی بڕگەیی فۆلکلۆریی کوردی لە جیاتی؛ تاکو کێشی عەرووز بە شێوەیەکی تەواو و یەکجارەکی ماڵئاوایی لەگەڵ شیعری کوردیدا بکات. لەبەر ئەوەی ئەم کێشە (کێشی بڕگەیی) کێشی نەتەوەیی کوردە و باشتر لەگەڵ تایبەتمەندییەکانی زمانی کوردیدا دەگونجێت[2]. بە پێچەوانەی نیما، گۆران لە باسکردنی هونەرە شیعرییەکەیدا جەخت لەسەر کاریگەریی شاعیرە تورکەکان و هەوڵە هاوشێوەکانیان لەم بوارەدا و پێکۆڵەکانی خۆی و تەنانەت شاعیرەکوردەکانی هاوچەرخی خۆی دەکات و دەڵێت:

**نووسەر و شاعیرانی ئەوسا، بە تایبەتی شیخ نوری و رشید نجیب و من، کە پێکەوە بە ئەدەبی تورکی متأسر بووین و پێکەوە ئەمان نوسی، ...وە ئەدەبی تورکی، قوتابخانەی شعری تازەی تیا پەیدا ببوو، کە پی یان ئەووترا (ادبای فجری ئاتی) لەوان (توفیق فکرت) و (جلال ساهر) بوون.. وە ئەدیبێکی تری تورک کە (عبدالحق حامده)ە ئەگەر چی لەم کۆمەڵە نەبوو بەلام دیسان هەر پی ی متأسر بووین، کە وا بی هەموومان بەیەکەوە ئەمان روانی یە یەک کلاوروژنە...**

**ئەم تازەکردنەوەیە بە (تەقلید) کردنی ئەدەبی تورکی روویدا. بەلام ئەدەبی تورکی جوولانەوەی تازەتری لی دەرکەوت کە تورکەکان لە رووی گیانیکی (قەومی)یەوە ئەهاتن کیشی هەلبەستە شعبی یەکانیان ئەژیانەوەو لە سەر ئەم کیشانە هەلبەستیان دائەنا.. کە ئەمەش کێشی هیجایە.**

**ئیتر من تەنها بە کوششی ئەوان نەوەستام و وەزنی هیجاشم وەرگرت و بە کار هینا**[3]...

---

(١) یوشیج، ن، (١٩٨٩/١٣٦٨)، ێ ١٠٤.

(٢) بڕوانە ل ١٠٤ و ١٠٥.

(٣) بیمار، ع، (١٩٧٠)، ل ٣.

ئەرێ چۆن دەکرێ و دەبێ ئەم دوو هەڵوێستە جیاوازە، واتا ساردی و بێ بایەخیی نیما و پەرۆش و پێشوازیی گەرمی گۆران بەرامبەر بە کێشی بڕگەیی لێک بدەینەوەو لێی تێبگەین؟

نیما زیاتر خۆی بە کێشە تەکنیکییەکانی شیعرەوە خەریک دەکات و نوێکردنەوەکەی لەمەڕ ئەو کێشە هونەرییە شیعرییانە دەخاتەوەگەڕ، کە بەجێماوی شیعری کۆنن. ئەو گۆڕانکارییانەی لەبواری مۆسیقای شیعری فارسیدا ئەنجام دەدات، دەرئەنجامی تێڕوانینێکی ڕەخنەیی هونەرین لەو کۆسپانەی کە ـ بەلایەوەـ لە ناوەوەی هونەری شیعری فارسیی کۆندا خۆیان دەنواند. نیما خۆی لە هەر جۆرە چاولێکردنی هونەری لە شیعری بیانی دوورەپەرێز ڕادەگرێت. ئاشنایەتیی لەگەڵ کێشە و ڕەهەندەکانی شیعری بیانی یارمەتیی دەدات بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە سەر شیعری نەتەوایەتی خۆی و لە ڕوانگەیەکی هونەری و بە بێ بەرچاوگرتنی هیچ هۆکارێکی دەرەکی و بە دیدێکی نوێ چاو بخشێنێتە سەر شیعری فارسی. بە لای نیما شکاندنی یاسای یەکێتی کێش و سەروای شیعری، چارەسەرێکی تەکنیکییە و لە ڕوانگەیەکی هونەرییەوە سەرچاوە وەردەگرێت. بۆ نیما ناسنامەی کێش یان سەروای شیعری هیچ کێشەیەک دروست ناکات. بەڵکوو کێشە لە شێوازی بەکارهێنانیاندایە. کە واتا نوێکردنەوەی نیما ڕیفۆرمێکی تەکنیکییە بۆ گۆڕان و چاکترکردنی سیستەمێکی بەسەراچوو.

بۆ گۆران بە پێچەوانەوە، ناسنامەی عەرووز وەکوو کێشێکی بیانی لە خۆیدا کێشەیە. گۆران لە سەردەمێکدا دەژیت کە ناسنامە و بەها نەتەوایەتییەکان لە لووتکەدان. هەر ئەم بەها و هەستەیە کە ـ وەکوو گۆرانیش ئاماژەی بۆ دەکات ـ وا لە هەندێ لە شاعیرە تورکەکان دەکات عەرووز وەکوو هێمای سەروەریی فەرهەنگی بیانی بەرپەرچ بدەنەوە و لە شیعری خۆیان وەدەری بنێن. لەوانەیە گۆران ئاگای لەو پێکۆڵانە بووبێت کە لە شیعری فارسیی سەردەمی نیماشدا بە هەمان

شێــوە و مەبەســت دراون. تێڕوانینێــکی ورد لــە بەرهەمەکــەی و لێکۆڵینەوەکەمان لە بواری ڕوخساری شیعرەکانی ئەو ڕاستییەمان بۆ دەرخست کە گۆران تەنیا دوو شیعری عەرووزیی بە شێوەی ئازاد هۆنیوەتەوە. شیعری (بت، ل**٤٨٣**) کە وەرگێڕانی شیعرێکی فارسییە و لە ساڵی **١٩٥٣** نووسراوەتەوە؛ مێژووی نووسینی ئەوی تر کە (ئاخ هەزار ئاخ، ل **١٨٥**)ە دیار نییە. کەچی ژمارەیەکی زۆری شیعرەکانی بە کێشی بڕگەیی یەککگرتوو هۆنراونەتەوە. واتا یەکێتیی کێشی شیعریان تێدا پێڕەو کراوە[1]. ڕاستە گۆران وەکوو بینیمان، شیعری بڕگەیی ئازادیشی هەیە و وا پیشان دەدات کە لایەنە هونەری و تەکنیکییەکەشی بەلاوە گرنگە، بەڵام بوونی یەکێتیی کێش لە زۆربەی شیعرە بڕگەییەکانیدا ئازاری نادات و ئەم ڕاستییە وا دەردەخات کە نەهێشتنی یەکێتیی کێش وەک چارەسەرێکی تەکنیکی ، بایەخێکی لاوەکیی لەلای هەیە و گرنگتر لەوە بەلایەوە ئەوەیە کە شیعر بە کێشی بڕگەیی کە کێشێکی نەتەوایەتییە، بهۆنرێتەوە. هەر بۆیە لە باس و قسەکانیدا سەبارەت بە نوێکردنەوەی شیعری، جگە لە جەختکردن لە سەر بڕگەیی بوونی کێشی شیعری نوێی، هیچ ئاماژە بە شیعرە ئازادەکانی و هۆی ئازادکردنەوەیان ناکات. ڕاستە کاتێ کە گۆران هۆکارەکانی هەڵبژاردنی کێشی بڕگەییمان بۆ باس دەکات، لەو باوەڕەدایە کە کێشی بڕگەیی لە گەڵ تایبەتمەندییەکانی زمانی کوردیدا باشتر دەگونجێت. بەڵام لێرەشدا ئەم بیرۆکەیە لە پلەی دووەمدا دێت. چونکە پێشتر جەخت لە سەر نەتەوایەتی بوونی کێشەکە دەکات. لەگەڵ عبدالرزاق بیماریشدا بینیمان ڕاشکاوانە

---

(**١**) بەداخەوە نەبوونی مێژووی هۆنینەوە لە کۆتایی هەندێ لە شیعرەکانی گۆران ڕێگامان پێ نادات چۆنیەتی بەرەو پێش چوونی پرۆسە نوێگەرییەکەی قۆناغ بە قۆناغ دەسنیشان بکەین. بەڵام لە بەر ئەوەی گۆران خۆی لە پێشەکیی کۆمەڵە شیعری *بەهەشت و یادگار*دا واز هێنانی وردە وردە و یەکجارەکی لە کێشی عەرووزیمان بۆ باس دەکات، ئێمە لەو باوەڕەداین کە ئەم دوو شیعرە پێش یان هاوکات لەگەڵ شیعرە بڕگەییەکاندا هۆنراون.

ئاماژە بەوە دەکات کە لەبەر ئەوەی «تورکەکان لە ڕووی گیانیکی (قەومی)یەوە ئەهاتن کیشی هەلبەستە شعبی یەکانیان ئەژیانەوەو لە سەر ئەم کیشانە هەلبەستیان دائەنا.. کە ئەمەش کیشی هیجایە.»[1] ئیتر خۆی بە کۆششی شاعیرە کوردەکانی هاوسەردەمی نەوەستا و وەزنی هیجاشی وەرگرت و بە کاری هێنا. هەر لە بەردەوامیی قسەکانیدا باس لە بوونی هەمان هەست لای هەندێ شاعیری ئەو کاتە دەکات و دەڵێت: «وە هەر لەم کاتەشا لە سوریە کامران بدرخان و قدری جان لە رووی هەستیکی نەتەوایەتیەوە هەلبەستی هیجائییان دائەناو لە گوڤاری (هاوار) بلاویان ئەکردەوە.» [2]

وردبوونەوە لە سیستەمی سەرواسازیی گۆران بە بەراورد لەگەڵ هی نیما ئەم باوەڕەمان لە لا پتەوتر دەکات. یەکێتیی سەروا لە شیعردا بە لای نیماوە ئاستەنگێکە لە بەردەم دێکلاماسیۆنی سروشتی شیعر و سنووری وشەگەلی شیعری لە شوێنی سەروادا تەسک دەکات و دەبێتە هۆی بوونی یەکئاوازی (monotony) لە شیعردا. نیما لەو باوەڕەدا بوو کە بە نەهێشتنی یاسای یەکێتیی سەروا و داهێنانی پێناسەیەکی تازە، ئەم کۆسپە لە ناو دەبات. لەمەودوا لە شیعرەکەیدا ئیتر واتای شیعر بڕیار لە سەر هاتن یان نە هاتنی سەروا دەدات. بینیمان کە باشترین نموونە بۆ سەروای ناوبەناو لە شیعری گۆراندا هەمدیسان شیعری (بت، ل٤٨٣)ە کە شیعرێکی وەرگێڕاوە و بە شێوەیەکی گشتی ژمارەی ئەو شیعرانەی سەروای ناوبەناویان هەیە لە شیعری گۆراندا لە چاو ئەو شیعرانەی سەروای خۆماڵی یا سەروای تێکەڵاویان هەیە زۆر نییە. گۆران تەنانەت لە دوا شیعرەکانی ژیانیدا وەکوو (مۆسکۆی ئەیار، ل **٣٢٤**) (بێشکەی منالْ، ل **٣٢٦**)، (تیر و کەوان، ل **٣٢٧**) و (بۆ لاوان، ل **٣٣٠**) کە هەموویان لە ساڵی **١٩٦٢** دا نووسراون، سەروای تێکەڵاوی بەکارهێناوە کە یاسای یەکێتیی سەروایان تێدا ــ بە جۆرێک لە جۆرەکان ــ پارێزراوە[3]. دیارە

(١) سەرچاوەی پێشوو، هەمان لاپەڕە.

(٢) هەمان سەرچاوە، هەمان لاپەڕە.

(٣) بڕوانە ل **١١٩**.

کێشەی سەرەکی سەروا لای گۆران یەکێتییەکەی نییە. ئەگینا لە بەرچی سەروای فۆلکلۆری کە بەش بە حاڵی خۆی یەکێتیی سەروا دەپارێزێت، زۆرترین بەکارهێنانی لە شیعری گۆراندا هەیە و لە جۆرە جیاوازەکانی شیعری گۆراندا شوێنی گرتووە و تەنانەت لە سەروای تێکەڵاودا ـ جگە لە جۆرەکانی تری سەروا کە ئەوانیش یەکێتیی سەروا پێڕەو دەکەن ـ بایەخێکی تایبەتی پێ دراوە[1]؟ ئەم پرسیارە وەڵام نادرێتەوە تەنیا بەوە نەبێت کە گۆران هەروەکوو تێڕوانینی لە کێشی شیعر، یەکەمجار تەماشای ناسنامەی سەروا دەکات و بەلایەوە سەروای فۆلکلۆری سەروایەکی نەتەوەیی کوردییە و دەبێ سوودی لێ ببینرێت. کە واتا پێناسەی کێشەی کێش و سەروا لای نیما و گۆران هەمان پێناسە نییە. لای هەردوو شاعیر سیستەمی کێش و سەروای کۆن سیستەمێکی بە سەراچووە. ئەم حوکمەش لای نیما لە بنەرەتدا لە بەها هونەرییەکانەوە سەرچاوە دەگرێت و لای گۆران لە بەها نەتەوایەتییەکان.

## زمانی شیعری

- **وشەگەلی شیعری**

لەوانەیە جێی سەرسوڕمان نەبێت ئەگەر تایبەتمەندییە زمانییەکانی شیعری ئەم دوو شاعیرە لە یەکدی جیاواز بن. وەکوو دیاردەیەکی تازە، شیعری نوێی نیما بە وشە و زاراوەی تەبەری ڕازێنراوەتەوە. ئەم کارە لە پلەی یەکەمدا بۆ ئەوە بووە کە شیعری شاعیر سروشتیتر لەوەی لە شیعری کۆندا هەبووە بێتە بەرچاو. سروشتی بوون نەک بە مانای وەسفی سروشت، بەڵکوو بەو مانایە کە ناوەرۆکی شیعری شاعیر هەرچی بێت، ئەگەر ویستی بۆ دەربڕینی سوود لە کەرەستە (object) سروشتییەکان ببینێت، ئەم کەرەستانە لە سروشتی ڕاستەقینەی دەوروبەری خۆیەوە وەربگرێت؛ بۆ ئەوەی پێوەندییەکی ئۆرگانیکی ڕاستەقینە لە نێوان شاعیر و دەوروبەریدا

(١) بڕوانە ل ١١٥-١٢٤.

دروست ببێت. نیما ڕەخنە لەو شاعیرە کۆنانە دەگرێت کە زۆرجار کەرەستەی وێنە شیعرییەکانیان دەربڕی سروشتی ڕاستەقینەی دەوروبەریان نەبوون. بۆیە وێنەکان زۆرجار لە شیعری کۆندا دووبارە دەبوونەوە. هەموو ئەو وشە و زاراوە تەبەرییانە ناوی دار و بەرد و گیانلەبەر و ڕەگەزی سروشتی ناوچەی مازەندەرانن کە نیما تێیدا لە دایک بووە و بەشێکی زۆری ژیانی خۆی لەوێ بە سەر بردووە ـ کە چی مەبەستی نیما بە هیچ شێوەیەک وەسفی سروشت نەبووە ـ. نیما بەم جۆرە پێوەرێکی نوێی ئیستێتیک بۆ وشەی وێنەی شیعری دەخاتە بەردەم شاعیران.

جیاوازیی گۆران لە نیما لەم ڕووەوە لەگەڵ جیاوازییەکانی بەشی مۆسیقای شیعری یەک دەگرێتەوە. بەلای گۆران ئەگەر پێویستە کە وشە و زاراوەی شیعری نوێنەرایەتیی کەسایەتیی شاعیر بکات، ئەمە نەک لە ڕێگای سروشتی ڕاستەقینەی شاعیرەوە، بەڵکوو لە ڕێگای ناسنامەی نەتەوایەتیی وشە و زاراوەکانییەوە دێتە دی. بۆ گۆران کێشەی زمانی شیعری کۆن لە کەمبوونی وشە و زاراوەی کوردی و پڕ بوونی لە زاراوەی بیانی بە تایبەتی عەرەبی و فارسیدایە. ئەم پێکۆڵەی گۆران لەگەڵ بزاڤی شاعیرە نەتەوەپەرستەکانی تورکدا کە دەیانویست شیعری تورکی لە وشە و زاراوەی بیانی پاک بکەنەوە، بێ پێوەندی نییە. ئەم بیرۆکەیە لە ئەنجامی پەرەسەندنی بزووتنەوە ناسیونالیستەکانی سەرەتای سەدەی بیستەمەوە هاتبووە کایەوە کە بە لایانەوە شانازیکردن بە سامانی فەرهەنگی خۆماڵی و دووبارە ژیاندنەوە و لابردنی کاریگەریی ڕەگەزە بیانییەکان لە ئامانجە سەرەکییەکان بوو و لەگەڵ لێک هەڵوەشانەوەی ئیمپراتۆریی عوسمانی گەشەیان کرد[1].

(١) آژند، ی، (١٣٦٤/١٩٨٥)، ل ٩١ و ١٤٨.

لە لایەکەوە تەوژمێکی هاوشێوە لە ناو هەندێ لە ڕۆشنبیرانی ئێرانی ئەوکاتدا سەری هەڵدا بوو کە پاککردنی زمانی فارسی لە هەموو جۆرە وشەیەکی بیانی و لە پێشەوەیان وشە و زاراوەی عەرەبییان کردبووە ئامانج. ئەمە مەبەستی سەرەکیی ئەنجومەنی *فرهنگستان ایران* بوو کە لە ساڵی **١٩٣٥** دا بۆ ئامادەکردنی فەرهەنگێکی وشەی فارسی دامەزرابوو. لە ڕۆژنامەکانی ئەو سەردەمەش *پیمان* و *مهر* بە توندی ڕۆشنبیرانیان بەرەو ئەو ئاراستەیە هان دەدا[1]. لە لایەکی تریشەوە و هەر لە هەمان کاتدا کاریگەریی زمانە ڕۆژئاواییەکان وای لە هەندێ شاعیر کردبوو کە زۆریان پێ خۆش بێت وشە و زاراوەی ڕۆژئاوایی لە شیعرەکانیاندا بە کار بهێنن و بە لایانەوە ئەمە دەکرا بە فاکتەرێکی تازەکردنەوەی شیعری دابنرێت. لەم بوارەدا کاریگەریی وشە و زاراوەی فەڕەنسی لە پێشەوەدا بوو و هەندێ جار بەکارهێنانیان دەگەیشتە ئاستێکی لەڕادەبەدەر و بێ مانا[2]. نیما ئامانجە شیعرییەکەی خۆی باش دەزانێت و هیچ پێوەندیی بەم دوو تەوژمەوە نییە. نە گومان لە بەکارهێنانی وشەی عەرەبیدا دەکات، کاتێ پێویستی شیعرەکەی وا دەخوازێت و نە ــ سەرەڕای ئەوەی لە زمانی فەڕەنسیدا سوارچاک بووە و لە گوتار و نووسینە ڕەخنەییەکانیدا سوودێکی زۆری لێ بینیوە[3] ــ وشە و زاراوەی ڕۆژئاوایی لە شیعرەکانیدا بە کار دێنێت. بە پێچەوانەی گۆران کە لێرەشدا چاو بەسەر ناسنامەی وشەکاندا دەخشێنێت، نیما بایەخ دەداتە کارکردی ئیستێتیکی وشەگەلی شیعری

---

(1) MACHALASKI, F., (1967), *op. cit.*, p. 15.

(٢) آرین پور، ی، *از صبا تا نیما*، جلد دوم، تهران ، انتشارات فرانکلین، **١٣٥٠/١٩٧١**، ص ٤١٧.

(٣) بڕوانە: یوشیج، ن، (**١٣٦٨/١٩٨٩**)، ل **٣٤٩**.

لـه ڕوانگـەی ئـەو پێـوەندییەی لـە گـەل جیهـانی بەرهەمـستدا دروسـت دەکات و ئەو ڕەنگە تازەیـەی بـە زمـانی شـیعر دەبەخشێت. گۆران لـە لایەک وشە عەرەبی و فارسی و تورکییەکان لە شیعرەکەی دەردەکـات؛ کەچـی پێویسـتیی بابـەتی شـیعرەکانی وا دەخوازێـت بـە پێچـەوانەی هەوڵەکەی، شیعرەکانی لە وشەی بێگانەی ڕۆژئاوایی پڕ ببنەوە.

جیـــاوازیی هاوشێـــوە بـــە شێـــوەیەکی بـــەرفراوانتر لـــە ئاســـت ڕەگـــەزەکانی تـــری زمـــانی شـــیعری لـــە نێـــوان ئـــەم دوو شاعیرەدا بەرهەستە.

## • دوو پێناسەی جیاواز بۆ «شیعری جەماوەر»

هـیچ یـەک لـەم دوو شـاعیرە وا پیشـان نـادات کـە شـیعرەکەی لـە جەماوەر و پێداویستییەکانی دوور دەخاتەوە. هەردووکیان کۆکن لـە سەر ئەوەی شیعر دەبێ بۆ خەڵک بنووسرێت. بـەڵام چـۆن؟ بـۆ ئـەوەی پێناسەی هەر یەک لەوانە بۆ چەمکی « شیعری جەماوەر» مـان بێتەوە دەسـت، کـە یارمـەتیمان دەدات باشـتر لـە هۆکـاری جیاوازییـەکانیان تێبگەین، پێویستە سنووری بەراوردەکـەمان لـە بـواری زمـانی شـیعری گۆران و نیمادا فراوانتر بکەین.

شـاراوە نییـە کـە هـەردووکیان بـە دوای زمانێـکی شـیعریی تـازەدا دەگەڕێن. لەم ڕووەوە نیمـا بـە ئاشـکرا باسـی ناتـەواویی زمانمـان بـۆ دەکـات. بەلایـەوە وشـەکانی زمـان وەکـوو خۆیـان لاوازن و توانـای دەربڕینی شیعرییان نییە. بە ڕای نیما ئەوە ئەرکی شـاعیرە کـە زمـانی شیعریی خۆی سەر لە نوێ بنیات بنێت. زمانێک کە نـە تـەنیا لـە زمـانی پێوەندی و دانوستاندنی ڕۆژانەی خەڵکی ناو شـەقام و بـازاڕ جیـاواز بێت، بەڵکوو جیاوازیشی هەبێت لەگـەڵ ئـەو زمانـە شـیعرییەی تـا ئـەو کاتە بەکارهاتووە. هەر بۆیە نیمـا هانـا بـۆ داهێـنانی وشـەی تـازە، بـە

کارهێنانی (onomatopoeia) و تێکدانی سیستەمی ڕستە سازی ـ بە پەنا بردنە بەر فۆرمە کۆنەکان ـ دەبات و وشەکان بە مانایەکی تازە بە کار دێنێت. ئەمە ڕەنگ و ڕوویەکی تازە بە زمانی شیعری نیما دەبەخشێت. بەڵام لە کاتی خۆیدا ئەم هەنگاوانە هەڵوێستی جۆراوجۆر و هەندێ جار ڕادیکالی لای خوێنەران لێ دەکەوتەوە؛ لەبەر ئەوەی شیعرەکان بێ مانا دەهاتنە بەر چاو؛ یانیش خوێنەران بە گوێرەی ئاستی تێگەیشتنی خۆیان شیعرەکانیان لێک دەدا و بە شێوەی جۆراوجۆر لێی تێدەگەیشتن. کە چی لە لایەکی ترەوە نیما پێی وایە شیعر بۆ خەڵک دەنووسرێت:

**دەبێ هونەرمەند ئەوە لە بەر چاو بگرێت کە بۆ خەڵکییە. خۆویستن نابێ بیخاتە ناو ئەو دیدە تەسکەدا کە من تەنیا بۆ پێستی خۆمم. لە ژیان لەگەڵ خەلکیدا ئەم خۆویستنە (کاتێ لە ڕادەبەدەر بایەخی پێ دەدرێت) سارد و لە بنەڕەتەوە زۆر شەرمێنەرە. هونەر کەرەستەی زامی هەموو ئێش و ئازارەکان و ئامرازی بەرەوپێشچوونە لە ژیاندا. لەبەر ئەوەی ئەوانی دی ژیانی ئێمە دروست دەکەن، هونەر شتێکی قەرزاری ئەوانە**[1]...

لە شوێنێکی تریشدا دەڵێت:

**[مرۆڤ] ئەرێ بۆ خۆی تەقەلاّ دەکات یا بۆ ئەوانی تر؟ بۆ نموونە ئەگەر شاعیرێک بۆ لاوازیی بینایی و ژانی لاقی و گرانی بیستنی یان زیندانی بوونی خۆی شیعری نووسیوە، کێشەیەک نییە. بەڵام ئەم غەم و ڕەنجە کە تەنیا خۆی تێیدا جێگیر بووە، غەم و ڕەنجی شاعیرانەیە و بۆ خۆی دەگەڕێتەوە. بە وتەی چێخۆف: « لە کاری ئێمە سوود بە کەس نەگەیشتووە و لەم حاڵەتەدا ئێمە تەنیا بۆ خودی خۆمان ژیاوین»**[2]...

---

(١) یوشیج، ن، (١٣٦٨/١٩٨٩)، ص ٣١٢.

(٢) هەمان سەرچاوە، ص ٣٥٢.

هەروەها لەبارەی هونەر بۆ هونەر یان بۆ جەماوەر دەڵێت:

**زۆر بیر لەوە مەکەنەوە کە هونەر بۆ هونەرە یان بۆ خەڵک. هونەر بۆ هەردووکیانە و لە دواییشدا بەرەو خەڵک دێت. لەبەر ئەوەی لە خەڵکەوە هاتۆتە دی و لە گەڵ خەڵکدا سەرەدەری دەکات. لەوە وریا بن کە چ شتێک بۆ [شیعر] وتن پاڵتان پێوە دەنێت و وتەکانتان بۆ چی و بۆ کێن و بۆ چ مەبەستێکی پێویست و باشتر، و لە نەبوونییەوە چ کێماسییەک بۆ گەلەکەتان دێتەوە دی[1].**

جا ئەگەر شیعر بۆ گەلە، بۆچی وانەبێت کە هەموو گەل بە ئاسانی لە ناوەرۆکی تێبگات؟ ئەوەی لە گوتارە رەخنەییەکانی سەردەمی نیما و تەنانەت هی پاش نیماشەوە دیارە، گوزارشت لەو راستییە دەکات کە نەک خەڵکی ئاسایی، بەڵکوو زۆر لە خوێنەرانی شیعری کۆن و رەخنەگرانی شیعری نوێش گلەییان لە نادیاری و تارمایی مانای شیعری نیما کردووە. خودی نیماش پاڵپشتی لەم کاراکتەرەی زمانە شیعرییەکەی دەکات و دەڵێت:

**دەبێت بزانن کە هەر شتێک کە قووڵ بێت، نادیارە. قووڵایی شتەکان هیچ نییە جگە لە تارمایی. شوێنی جووڵانەوەی هونەرمەند ئەم پانتاییەیە (لە کاتێکدا کە دەیەوێت بگاتە هەموو شتێک و بە هەر شتێک بە هێزی خۆیەوە هەست بکات) ئەم پانتاییە هونەرمەندی راستەقینە تێنووتر دەکات... ئێوە زۆرجار رووبەڕووی بەرهەمێک بوونەتەوە کە هەر ئەم تارماییە جوانتری کردووە و هێزی چوونە ناوەوەی قووڵی پێ بەخشیوە... «مرۆڤ لە بەرامبەر ئەو بەرهەمە هونەرییانە یان ئەو شیعرانە حەزێکی زیاتر پێشان دەدات کە هەندێ لایەنی تەم و مژاوی و نادیار و قابیلی راڤە کردن و لێکدانەوەی جیاواز بن.»[2]**

کە واتا تارمایی شیعری رێگا لە بەردەم تەکواتا بوونی شیعرەکان دادەخات و لە گەڵ پرەنسیپی یەک مانای شیعری بۆ هەمووان دادەبڕێت. دیارە بە رای نیما «شیعری جەماوەر» مانای ئەوە نابەخشێت کە زمانی شیعر لە ئاست تێگەیشتنی هەموو چینەکانی

---

(١) هەمان سەرچاوە، ص ٣٥٢.

(٢) یوشیج، ن، (١٩٨٩/١٣٦٨)، ص ١٦٧.

کۆمەڵگادا بێت. شاعیر پێش هەموو شتێک هونەرمەندە و کەرەستەی هونەرەکەشی زمانە. بۆی هەیە لە بەرهەمیدا باس لە مەینەتییەکانی گەل بکات و بیانکاتە بابەتی سەرەکیی شیعرەکانی. بەڵام ئەم بابەتانە نابێ ئاستی بەرهەمی شیعری بهێننەوە ئاست تێگەیشتنی هەموو جۆرە خوێنەرێک. ئەگینا بەرهەمی شاعیر لە ڕووی داهێنانەوە هەژار دەبێت. «شیعری جەماوەر» ئەو شیعرە نییە کە هەموو گەل بە تێکڕایی لێی تێبگات. بەڵکوو ئەو شیعرەیە کە بۆ گەل و بە ناوی گەل، بەڵام بە زمانێکی هونەریی بەرز دەهۆنرێتەوە. زمانێک کە خۆی لە یاساکانی زمانی ئاسایی ڕزگار بکات و داهێنانی تێدا بکرێت. بۆیە نیما دەڵێت:

**داهێنانی شیعری ئاراستەی خەڵکانی تر دەکرێت، جا بە هەندێکیان یان بە هەموویان**[1].

کە واتا مەرج نییە هەموو خوێنەرێک توانای لێکدانەوەی شیعری نیمای لەلا بێت و لێی تێبگات. شیعری نیما شیعری نوخبە یا خود ئەو چینە خوێندەوار و پێگەیشتووەیە کە ئاشنایەتیی باشی لە بواری هونەری شیعر و شیعری کۆندا بە گشتی و لە بواری شیعری نوێ و ڕەهەندە تازەکانیدا بە تایبەتی هەیە. ئەم ئاراستەیەش نەک لە ویستی ڕەپ و ڕووتی شاعیر لە لەیەک خستنەوەی دوو جەمسەری ڕەوانی و تارمایی شیعری لە دوو جۆرە شیعری میللی و شیعری نوخبەدا، بەڵکوو لە بنیاتدا لە چۆنیەتی ڕوانینی بۆ ڕۆڵی شاعیر لە ناو کۆمەڵگادا دێتە کایەوە. ئاراستەی شیعری سادە و ساکار و گوتاری شیعری ڕەوانی لە ئاست تێگەیشتنی هەمووان، جێی بایەخی ژمارەیەکی زۆری شاعیرانی پێش نیما بوو. ئەوانەی وەکوو فرخی یزدی، میرزادە عشقی، ایرج میرزا،... کێشە ڕامیارییەکانی وڵات و

---

(١) آرین پور، ی، (**٢٠٠٠/١٣٧٩**)، ص ٦٠٥.

گرفتـه کۆمەڵایەتییـەکانی گـەلیان کردبـووە تـەوەری سـەرەکی بابـەتی شیعرەکانیان[1]. گرنگی دانی زۆر بە لایەنی ناوەرۆکی شـیعری لـە سـەر حیسـابی ڕوخسـاری شـیعرەکانیان بـوو. ئـەم دیاردەیـە گەیشـتبووە ڕادەیـەک، کـە ئەگـەر کێـش و سـەروامان لـە هەنـدێ لـە شـیعرەکانی ئەوکات لادابا، تەنیا گوتارێکی ڕەپ و ڕووتی ڕامیاری یان کۆمەڵایـەتی لێـی بـە جـێ دەمایـەوە. دیـارە نیمـا ئـەم جـۆرە تێکسـتانە سـەرەڕای ناوەرۆکەکـەیان بـە شـیعری هونـەری و بـەنرخ دانانێـت و بـە لایـەوە ڕوخساری شیعر و شێوازی تێکسـتی شـیعری بـە قـەدەر ناوەرۆکەکـەی گرنگە و دەبێ بایـەخی پـێ بدرێت. باسکردنی بابەتـەکانی ژیـانی گـەل نابێ ببێتە هۆی دابەزینی ئاستی هونەریی گوتـاری شـیعری. بـە کـورتی و کوردیەکەی، ئەگەر بۆ نیما گرنگیـی وەڵامـی پرسـیاری «شـیعر چـۆن دەڵێـت؟» لـە هـی پرسـیاری «شـیعر چـی دەڵێـت؟» زیـاتر نەبێـت، کەمتر نییە.

گۆران ڕێوشوێنی پێچەوانەی نیما دەگرێتەوە بەر و شـیعری نوێـی خـۆی لـە هـەر جـۆرە تارمـایی مانـا دوورەپەرێـز ڕادەگرێت. کـاتێ لـە شـیعرەکانیدا هەنـدێ لـە وشـە بیانییـەکان بـە وشـەی ڕەسـەنی کـوردی دەگۆڕێت، بۆ نەهێشتنی هەر جۆرە نادیـاری یـان دوودڵییـەکی مانـایی لـــە پەراوێـــزی دیوانەکەیـــدا لێـــکیان دەداتـــەوە. ئەمـــە تـــەنیا وشەکوردییەکان ناگرێتەوە؛ بەڵکوو ئەو وشانەش کە بەبێ گۆڕانکـاری شوێنی خۆیان لە شیعرەکانیدا دەپارێـزن، یـان ئەوانـەی کـە لـە زمانـە ڕۆژئاواییەکانەوە وەرگیراون. بـە پێچـەوانەی فرەواتاییـە (polysemy) ڕاسپێردراوەکەی نیما، گوتارە (discourse) شیعرییەکانی گۆران زیـاتر

(1) MACHALASKI, F., (1965), *op. cit.,* pp.149 ; MACHALASKI, F., (1967), *op. cit.*, pp. 39-85.

مانایـەکی ڕاسـتەوخۆیان هەیـە. هـەر لەسـەر هـەمان ڕێـڕەو، بنیاتـە زمانییە شیعرییەکانی گۆران سادەن و ئاڵۆزی ڕستەسازییان تێدا نییـە. بـە پێچـەوانەی سەمبۆلیسـمی نیمـا، لێکچـواندن ـ لەبـەر دیـاربوونی ڕەگـەزە پێکهێـنەرەکانی و دیـاری و ڕەوانی ئـەو مانایـەی دەیـەوێ بگەیەنێـت، بەرجەسـتەترین وێـنەی شـیعریی گۆرانـە. هـەموو ئـەم فاکتەرانـە سیمایەکی ڕاستەخۆ بـە مانـای شـیعری گـۆران دەبەخشـن. هەر ئـەم ڕوونی و سـادەیی مانایەشـە کـە سـەرنجی گـۆران بـۆ شـیعری فۆلکلۆریی کوردی ڕادەکێشێت و وای لێدەکات شێوازێکی هاوشێوەی بۆ شیعرەکانی خۆی پەسند بکات. ژمارەی کەمی ڕەمزە شیعرییەکانی و جـۆری بەکارهێنانیشـیان لەگـەڵ هونـەرە شـیعرییەکەیدا کـۆکن. چـونکە وا بەکارهێـنراون کـە خوێـنەری ئـەوکات بـۆ دۆزینـەوەی نیشانکراوەکان پێویستیی بـە خۆماندووکردنێکی زۆر نەبێت. گـۆران تێکۆشەرێـکی ژێـر کاریگـەریی ئایـدیۆلۆژی کۆمۆنیسـم بـووە و لـە چوارچێوەی ڕیالیزمی سۆسیالدا، شیعرەکانی خـۆی ئاراسـتەی گشت توێژ و چینەکانی کۆمەڵگا کردووە؛ بـۆ ئـەوەی بـۆ سـەنگەری خـەباتی دژ بــە ئــەمپریالیزم هانیــان بــدات. پیاهەڵــدانی ئاشــکرای خــەباتی هاوشێوەی گەلانی تری ڕەنجبەر و تێکۆشەری جیهان شوێنێکی دیـاری لە شیعرەکانیدا داگیرکردووە. شـاعیر بـەرگری لـە کێشـەی گـەلی کـورد دەکات و دەیخاتە چوارچێوەی کێشـەی گشت نەتـەوە سـەرکوتکراو و چەوساوەکانی ژێر چەپکی ئەمپریالیزمی جیهانی. لە پێشەکیی شیعری (لاوکی سوور بۆ کۆریای ئازاد، ل **٢٣٥**) دا دەڵێت:

**ئاشکەرایە کۆرییایی یە باکووری یەکان (شیمالی یەکان) کۆمیوونیستن.... بە دوو چاوی زەق ئەبینم چەقۆ خراوەتە گۆشتی نەتەوەیەکی ئازای ئازاد، تـەنیا لـە بـەر**

**ئەوەی چۆن خۆی ئەیەوێ وا ئەژی، پاسەوانە ڕاستەقینەکانی دیموکراتی یش بە هەموو دڵ ڕەقی یەک ئەڵێن: نەء، ئێمە چۆنمان ئەوێت ئەبێ وا بژیت! ...**

**ئەمجا، ئەگەر بە بۆنەی بە سەرهاتی داماویی کۆریاوە فرمێسکێکی دڵسۆزانە بە سەر برینی هەردوو لای ئەوانیش و خۆشمانا بڕێژم، باوەر ناکەم کەس بتوانێ زاتی ڕێ لێ گرتنم بە دڵا بهێنێ.**

ئامانجی گۆران ئەوەیە کە پەیامی گوتارە شیعرییەکانی بگەیەنێتە ژمارەیەکی هەرە زۆری خوێنەران و هەست و بیرێکی هاوشێوە لە لای هەموویاندا دروست بکات. ئەمە نایەتە دی مەگەر بەر گوتارێکی ڕاستەخۆ و دوور لە هەرجۆرە تارماییەکی مانایی. بۆ ئەم مەبەستە گۆران بە پێچەوانەی نیما پێویستیی بە زمانێکی نزیک لە زمانی دان وستاندنی ڕۆژانەی خەڵکەوە هەیە. ئەم جیاوازییەی مێتۆدی شیعری لە مەبەستی بەکارهێنانی ئامرازەکانی دەنگی (onomatopoeia)شدا دیارە. ئەم کەرەستانە بۆ نیما فاکتەری نزیک کردنەوەی شیعر لە سروشت و دەروبەری شاعیرن؛ کە چی بۆ گۆران کە جگە لەوانە (interjection)یش بە کار دێنێت، ئەمانە ئامرازی نزیک خستنەوەی زمانی شیعرن لە زمانی خوێنەر.

لێرەدا دوو بۆچوونی جیاواز بۆ چەمکی «شیعری جەماوەر» بەرەوڕووی یەکتر دەبنەوە. نیما لایەنگری شیعرێکی نووسراوە بۆ گەل، بەڵام بە زمانێکی شیعریی بەهێز، دەوڵەمەند و ڕازاوە؛ زمانێک کە شاعیر کاری تێدا کردبێت و خۆی پێیەوە ماندوو کردبێت و دایهێنابێت. بەڵام هێزی زمانی شیعری گۆران لە زمانی گەلەوە سەرچاوە وەردەگرێت و «شیعری جەماوەر» بۆ گۆران شیعری هەموو چینەکانی کۆمەڵگایە. بۆیە هەر ئەوەندە بۆ شاعیر بەسە کە لە

تایبەتمەندییەکانی ئەو زمانە سوود وەربگرێت و زمانی شیعری خۆی پێیەوە دابڕێژێت.

بوونی وشە و زاراوەی بێگانەش لە شیعری گۆراندا بە پێچەوانەی زمانی شیعری نیمایە. بە تایبەتی ئەو وشە و زاراوانەی کە پێوەندییان بە کولتووری ژیانی ڕۆژانەوە هەیە. هەندێکیانیش ڕامیارین و پێویستیی ناوەرۆکی شیعر بووەتە هۆی هاتنەوەیان بۆ ناو شیعری گۆران. بە پێی ئایدیۆلۆژیاکەیەوە گۆران کێشەی کورد بە کێشە نێودەوڵەتییەکان (ئەنتەرناسیونالیستەکان)ەوە دەبەستێت و وشە ڕامیارییە بە کارهێنراوەکانیشی هەر لەو ئاراستەیەدا مەودایەکی ئەنتەرناسیونالیست دەگرنەوە خۆیان. دیارە تێڕوانینی گۆران بۆ زمانی شیعر بەر لەوەی تێڕوانینێکی زمانەوانی تەکنیکی بێت، تێڕوانینێکی ئایدیۆلۆژیە.

لە ئێرانی سەردەمی نیماشدا ناسینی شیعر و ئەدەبی ڕۆژئاوایی و تا ڕادەیەکیش بە ڕۆژئاوایی کردنی هەندێ لایەنی ژیانی خەڵک، وای لە هەندێ لە شاعیران کرد وا بیربکەنەوە کە بە جێگیرکردنی وشە و زاراوەی ڕۆژئاوایی لە شیعرەکانیاندا لە جیاتی وشە فارسییەکان، دەتوانن بەرگێکی مودێرن بکەنەوە بەر شیعری فارسی[1]. هیچ شوێنەوارێک لەم هەوڵانە لە شیعری نیمادا بەدی ناکرێت. بۆ داهێنانی

(١) ئەم هەوڵە زۆر لەوانە دەچێت کە لە لایەن دەستەڵاتی ئەوکاتەوە بۆ مۆدێرنیزەکردنی ژیانی خەڵک دەدران و جگە لە گۆڕانی ڕواڵەتەکان ئەنجامی تریان نەبوو. بۆ نموونە پیاوان هان دەدران کە جل و بەرگ بە شێوازی ئەورووپی بکەنە بەر و ژنانیش ناچار دەکران چادر لە سەر سەریان هەڵگرن، بە بێ ئەوەی هیچ هەنگاوێکی بنەڕەتی بۆ گۆڕینی عەقلییەت و شێوازی بیرکردنەوەیان بهاوێژرێت.

MORRISON, G., (1982), *op. cit.* pp. 179-180 ; MAKHALASKI, F., (1967), *op. cit.*, p. 149.

زمانێکی تازە، نیما پێویستیی بەم جۆرە کەرەستانە نییە. چونکە بە کارهێنانیان هیچ گۆڕانکارییەکی بنیادین ناخاتە سیستەمی زمانەوانیی کۆنی شیعری فارسی. پێویستە زمانی شاعیر ڕەنگدانەوەی ئەو بیئەیە بێت کە شاعیر تێیدا شیعرەکەی دەهۆنێتەوە. وشە و زاراوە بیانیەکانیش لەگەڵ ئەو بیئەیەدا بێگانەن.

# نوێکردنەوە: دابڕان لە چی؟

ئەگەر باوەرمان بەوە هەبێت کە هەر نوێکردنەوەیەک لە خۆیدا بریتیە لە دابڕان لە ڕەگەزەکانی ڕوخسار یا ناوەرۆکی کۆن و شوێنگرتنیان بە ڕەگەز و فاکتەری نوێ بە گوێرەی هەندێ پێوەری تازەوە، ئاخۆ بنیاتی ئەم دابڕانە لە شیعری نوێی گۆران و نیمادا لە چیدا خۆی دەنوێنێت؟ واتا لە بناغەوە لە گەڵ چیدا ئەوان لە دابڕاندان؟

لە توێژینەوەی شیعرەکانی نیما وا دیارە کە نوێکردنەوەکەی دوو دابڕانی سەرەکی بە خۆیەوە دەگرێت. یەکەمیان دابڕانێکی ناتەواوە لە کلاسیزم (partial rupture). نیما هەوڵ دەدات لەگەڵ هەندێ لە کاراکتەرە کلاسیکەکانی ڕوخساری شیعر دابڕێت؛ لەوانە یەکێتیی کێش و سەروا، هەژاریی چوارچێوە زمانیەکەی، تاد. بەڵام ئێمە ئەم دابڕانە بە ناتەواو (جزئی) ناوی لێ دەنێین؛ لە بەر ئەوەی ئەم کاراکتەرانە بە شێوەیەکی ڕادیکاڵ لە شیعری خۆی لا نادات و بەرپەرچیان ناداتەوە. کێشی عەرووز هەر وەکوو بنەمای کێشی شیعری نیما پارێزراو دەبێت و سەرواش بە تەواوی و یەکجارەکی لە شیعرەکەی دوور ناخرێتەوە، بەڵکوو شێواز و شوێنی بەکارهێنانی دەگۆڕدرێت. لە ڕووی زمانیشەوە، نوێکردنەوەی نیما دەکرێ بە وەرچەرخانێکی نێوخۆیی زمانی شیعری فارسی دابنرێت کە بە تێکدانی سیستەمی سەنتاکسی زمان، تارمایی مانا و نادیاریی نیشانکراوە شیعرییەکان، بە کارهێنانی وشە و زاراوەی زمانی تەبەری و (neologism)، پێوەندیی زمان و دەور و بەر....بەرجەستە دەبێت.

دووەم دابــڕانی نیمــا دابڕانــە لەگــەڵ ئــەو ڕەهەنــدە شــیعرییە هاوچەرخانەی خەریک بوون بەشێکی ناوەندە شیعرییەکانی ئێرانی ئەو کات داگیر بکەن؛ ئەوانەی پێش نیما یان هاوکات لە گەڵیدا دەستیان بە نووسینی شیعر بە گوێرەی هەندێ پێوەری ئایدیۆلۆژی کرد کە بریتی بوون لە پاک و خاوێن کردنی زمانی شیعری فارسی لە وشەی بیانی بە تایبەتی عەرەبی، لادانی کێشی عەڕووز وەکوو ڕەگەزێکی بیانی لە ناو شیعری فارسیدا، بەهادانەوە بە کێشی شیعری کۆنی فارسی، سادە و ساکارکردنی گوتاری شیعری، بە کارهێنانی وشە و زاراوەی بیانی بە ناوی مۆدێرنیزم، تاد. بەشێکی زۆری ئەم هەولانە بۆ ناسیۆنالیزە کردنی شیعر بوون، بەبێ ئەوەی وەڵام بۆ پرسیار و کێشە تەکنیکییە کۆنەکان بدۆزنەوە. نیما لە ڕوانگەیەکی نەتەوەپەرستانە یان ئایدیۆلۆژییەوە تەماشای شیعر ناکات. تێڕوانینی نیما بۆ شیعر، وەکوو گوتمان، لە ڕوانگەیەکی هونەرییەوەیە. ڕاستە کە پێ دەچێت دەستپێشخەریی هەندێ شاعیری پێش نیما لەم بوارەدا بیرۆکەی ئەم تێڕوانینەی خستبێتەوە مێشکییەوە. بەڵام جۆری تێڕوانینەکە و پەیداکردنی کێشە هونەرییەکان، پێوەندیی ڕاستەخۆی بە بلیمەتی و داهێنانی خودی نیماوە هەیە. بەمە نیما توانی شوێنێکی دیار و جیاواز لە هاوچەرخەکانی بۆ خوی دابین بکات و ناوی خۆی وەکوو باوکی شیعری نوێی فارسی لە مێژووی شیعر و ئەدەبی فارسیدا تۆمار بکات.

دابڕان لە شیعری مۆدێرنی گۆراندا لەو فاکتەرە کلاسیکانەیە کە لە گەڵ سامانی ئەدەبی نەتەوایەتیی کوردیدا بێگانەن. لەوانە کێشی عەڕووز کە بە لایەوە ڕەگەزێکی شیعری بیانییە و لەگەڵ تایبەتمەندییەکانی زمانەکەماندا ــ بە گوێرەی گۆران ــ بە تەواوی ناگونجێت؛ لە کێش و سەرواسازیدا لە ژمارەیەکی کەمی شیعردا وا پیشان دەدات کە وەکوو نیما بیر لە تەکنیکی بەکارهێنانیان دەکات،

کەچی دواتر دیار دەبێت کە گەڕان بۆ کێش و سەروای نەتەوایەتی مەبەستی سەرەکیی نوێکردنەوەکەیەتی و ئەوەندە کە بوونی ئەم ڕەگەزانە لە شیعردا بە لایەوە گرنگە، چاوخشاندنەوە بە سەر کەم و کۆڕییە تەکنیکییەکانی شیعری بەلایەوە لە چاو هونەری نوێکردنەوەکەی نیما بایەخی نییە. هەروەها کەمکردنی وشە و زاراوەی بیانیی عەرەبی، فارسی و تەنانەت تورکیش تەوەرێکی تری ناسیۆنالیزە کردنی شیعری نوێی گۆرانە. کەچی لە هەوڵێکی پێچەوانەدا بە کارهێنانی وشە و زاراوەی ڕۆژئاوایی بە لایەوە ئاساییە و نیشانەی مۆدێرنیزمی شیعرەکەیەتی. گۆران لەبەر ئەوەی شیعری ڕامیاری دەنووسێت، لایەنگری سادەیی و ساکاریی گوتاری شیعرییە و بۆ ئەم مەبەستەش بە پێچەوانەی شیعری نیما، لێکچوواندن دیارترین و باوترین وێنەی ڕەوانبێژیی شیعرەکەیەتی و جۆری ڕستەسازییەکەشی بە زۆری جیاوازییەکی نائاساییی ئەوتۆ لە گەڵ سیستەمی ڕستەسازیی زمانی کوردیدا تۆمارناکات. لە زۆربەی ئەم هەنگاوانەدا گۆران کاراکتەرەکانی شیعری فۆلکلۆری دەکاتە نموونەی شیعری تازەی خۆی. چونکە ئەم شیعرە بە لایەوە سامانێکی نەتەوایەتیی ڕەسەنە و ئەم هەزرە ڕەخنەییەش لە ڕوانگەیەکی ئایدیۆلۆژییەوە سەرچاوە دەگرێت. تێڕوانینی گۆران کە لەگەڵ تێڕوانینی زۆربەی شاعیرانی تورک و فارسی سەردەمیدا یەک دەگرێتەوە، لە تێڕوانینی نیما بۆ شیعر جیاوازە و لێرەدا دیار دەبێت کە بۆچی گۆران، تەنانەت ئەگەر نیماشی ناسیبێت[1]، لە نوێکردنەوەکەیدا نەکەوتۆتە ژێر کاریگەریی هونەرە شیعرییەکەی و بە گوێرەی بیروباوەری خۆی سەرنجی لە هەندێ سەرچاوەی تری کاریگەری وەکوو شیعری تورکیی هاوچەرخ داوە.

---

(١) وەکوو لە سەرەتای باسەکەماندا بینیمان، هەموو ئەو بەڵگانەی لە بەردەستماندان بەرەو ئەو بیرۆکەیە پاڵمان پێوە دەنێن.

# ئـەنـجـام

پێشـهاتەکانی سـەردەم و ڕووداوە ڕامیـاری و کۆمەڵایەتییـەکان و تـەوژمی مۆدێـرنیزم کـە ناوچـەکەی گرتبـووەوە، هەنـدێ گۆڕانکـاریی بنەڕەتییان لە شـیعری کـوردی و فارسـیی سـەرەتای سـەدەی بیسـتەمدا تۆمار کرد. هەوڵی شاعیرانی کورد و فارسی سەرەتای ئەم سـەدەیە بـە هەوڵ و تەقەلاکانی گۆران و نیمـاوە هاتنـەوە بەرهـەم. بـە پێچـەوانەی نـەریتی شـیعری کلاسـیکی کـوردی کـە بـە درێـژایی مێـژووی خۆیـدا بـە شیعری کلاسیکی فارسـییەوە کاریگـەر بـوو، شـیعری نوێـی کـوردی لای گۆران خۆی لـە کاریگـەریی شـیعری نوێـی فارسـی دەدزێـتەوە. گـۆران سـەرەڕای شـارەزایی باشـی لـە بـواری شـیعری کـۆن و نوێـی فارسـیدا سەرنج ناداتەوە شیعری نوێی نیمایی و پێیەوە کاریگەر نابێت. بـەڵکوو ڕوو لــە شــیعری تــورکی و ئــەورووپی دەکــات و دەکەوێــتە ژێــر کاریگــەرییان. هۆکـاری ئـەم بـێ بایەخییـەش دەگەڕێـتەوە بـۆ دوو تێـڕوانینی جیـاوازی هونـەری و ئایـدیۆلۆژی لـە شـیعر لای ئـەم دوو شـاعیرە. گـۆران پێـڕەوی لـەو تەوژمـە دەکـات کـە ژمارەیـەکی زۆری شاعیرانی تورک و تەنانەت فارسی هاوسەردەمی بە خۆیـەوە خـەریک کردبوو و بریتی بوو لە بەنەتەوایەتی کردنی شیعر و ئـەدەبیات. شـیعر بــۆ ئەمانــە بــەر لــە هــەر شتێــک پێناســەیەکی نەتەوایەتییــە و کەرەسـتەیەکی ڕامیارییـە بـۆ سـەڵماندنی بـوونی نەتەوایـەتیی خـۆی. ئەمەش لە تێڕوانینێکی ئایدیۆلۆژییەوە سەرچاوە وەردەگرێت. بـەڵام نیمـا خـۆی لـەم تەوژمـە دوور دەخاتـەوە. تێـڕوانینی نیمـا لـە شـیعر تێڕوانینێــکی ئایــدیۆلۆژی نییــە و شــیعر بــۆ نیمــا، پێــش ئــەوەی ناسنامەیەکی نەتەوایەتی یـان ئامرازێکی ڕامیـاری ڕەپ و ڕووت بێت،

کەرەستەیەکی هونەرییە و ئەو هونەری بوونەش خۆی لە کۆمەڵێ یاسا و نەریتی تەکنیکیدا دەنوێنێت کە پێویستییان بە چاولێخشاندن، ڕاستکردنەوە و نوێکردنەوە هەیە. بۆیە دەکرێ لە ڕووی سەرچاوەی کاریگەرییەوە شیعری نوێ بە خاڵی وەرچەرخان لە مێژووی شیعری کوردیدا دابنێین؛ بەوەی کە لە ڕەهەندە سەرەکییەکانیدا کاریگەریی شیعری فارسی پێگە ناوەندییەکەی خۆی لە دەستدا و شیعری کوردی خۆی لە کاریگەریی زەقی شیعری فارسی بۆ یەکەمجار دزییەوە و بۆ دۆزینەوەی سەرچاوەی لاسایی کردنەوە ڕووی کردە شیعری نەتەوەکانی تر.

# بيبليوگرافيا

## كوردی


* ئاشـنا، د، *گـۆران، نووسـين و پەخشـان و وەرگێـڕانەكانی*، هەولێـر، ئاراس، **٢٠٠٢**.
* ئامێـــدی، ص، *هۆزانڤانێـــت كـــورد*، بەغـــدا، كـــۆری زانيـــاری عێراق، **١٩٨٠**.
* بـەرواری، ك، *پـەروا چـيا*، بەغـدا، ئەمينـداريا گشـتيا ڕۆشـنبيری و لاوان، **١٩٨٦**.
* بەكر محەمەد، م:
- « ئـەدگارەكانی نوێـكردنەوە لـە شـيعری ڕەحمـی هەكاريـدا» لـە گۆڤارا زانكۆيا دهوك، ژ **٤**، دهوك، زانكويا دهوك، **١٩٩٩**؛
- «سيما عەرووزيەكانی قۆنـاغی گواسـتنەوەی شـيعری كـوردی» لـە گۆڤارا زانكۆيا دهوك، ژ **١**، دهوك، زانكۆيا دهوك، **١٩٩٨**.
* بۆرەكەيی، ص، *مێژووی وێـژەی كـوردی*، بـەرگی **١**، بانـە، انتشـارات ناجی، **١٣٧٠**.
* بيمـار، ع، « دانيشتنێـك لەگـەل گـۆران دا» لـە *گۆڤـاری بـەيان*، ژ **٢**، بەغدا، **١٩٧٠**.
* بێكەس، ش، «چەند سەرنجدانێك لە گۆرانی لووتكـە» لـە *ڕۆشـنبيری نـوێ*، ژ **٦٤**، بەغـدا، دەزگـای ڕۆشـنبيری و بڵاوكردنـەوەی كـوردی، **١٩٧٨**، ل **٥٨-٦٨**.
* خەزنـەدار، م، *كێـش و قافيـە لـە شـيعری كوردیـدا*، بەغـدا، الوفـاء، **١٩٦٢**.
* رسول، ع، :
– *ئەدەبی فۆلكلۆری كوردی*، بەغدا، دار الجاحظ، **١٩٧٠**؛
– « ڕياليزمی نوێ و ئەدەبياتی كوردی» لە *ڕۆشـنبيری نـوێ*، بەشـی يەكـەم، ژ **١٢٢**، بەغـدا، دەزگـای ڕۆشـنبيری و بـڵاو كردنـەوەی كوردی، **١٩٨٩**.

* ڕەشید، خ، *ڕێبازی ڕۆمانتیکی لە ئەدەبی کوردیدا*، بەغدا، دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاو کردنەوەی کوردی، **١٩٨٩**.
* ڕەفیق حلمی، *شیعرو ئەدەبیاتی کوردی*، بەرگی **١**و**٢**، چ دووەم، هەولێر، **١٩٨٨**.
* سەجادی، ع، *مێژووی ئەدەبی کوردی*، چاپخانەی مەعاریف، بەغدا، **١٩٧٢**.
* سەرکار، خ، *سروودی کوردی*، سلێمانی، ئینستیوتی کەلەپوری کوردی، **٢٠٠٥**.
* شارەزا، ک، « گۆران و بە کار هێنانی نوێی ڕەمزەکانی نەورۆز» لە *پاشکۆی کاروان*، ژ ١٨، هەولێر، ڕۆشنبیری و لاوان، **١٩٨٤**.
* عارف، م، « تەئسیری زمان و ئەدەبی فارسی لە سەر ئەدەبی کوردی» لە *گۆڤاری کۆلێژی ئەدەبیات*، ژمارە ١٨، بەغدا، زانستگای بەغدا، **١٩٧٤**.
* عەلی، د، *بنیاتی هەڵبەست لە هۆنراوەی کوردیدا*، سلێمانی، ڕەنج، **١٩٩٨**.
* گۆران، *دیوانی گۆران*، کۆ کردنەوە و ئامادە کردنی محمدی مەلا کریم، بەغدا، کۆڕی زانیاری کورد، **١٩٨٠**.
* گەردی، ع،
  - *سەروا*، هەولێر، دەزگای چاپ و بڵاو کردنەوەی ئاراس، **١٩٩٩**.
  - *کێشی شیعری کلاسیکی کوردی و بەراورد کردنی لە گەڵ عەرووزی عەرەبی و کێشی شیعری فارسیدا*، هەولێر، وەزارەتی رۆشنبیری، **١٩٩٩**.
* محمد حاجی، ش، *بەراوردی سەروا لە نێوان دوو شاعیری نوێخواز (گۆران و نیما یوشیج) دا*، لێکۆڵینەوەی دەرچوون، ئەدەبی کوردی، زانکۆی سەلاحەددین، **٢٠٠٠**، **٧٤** لاپەڕە، دەستنووس.
* مەولوود، ع، «چل شیعری عەرووزی گۆران» لە *گۆڤاری ڕامان*، ژ **٥٠**، هەولێر، دەزگای گوڵان، **٢٠٠٠**.
* میراودەلی، ک، « سەرەتایەک بۆ لێکۆڵینەوەی شێعری کلاسیکی کوردی» لە *دیداری شیعری کلاسیکی کوردی*، ئامادەکردنی حەمە

کـەریم، ح، بەغـدا، دەزگـای ڕۆشـنبیری و بڵاوکردنـەوەی کـوردی، **١٩٨٦**.
* KURDO, Q., *Tarixa edebîyata kurdî*, Stokholme, Roja Nu, 1983.

## فارسی

* آرین پور، ی،
– *از صبا تا نیما*، جلد دوم، تهران ، انتشارات فرانکلین، **١٣٥٠/١٩٧١**.
– *از صبا تا روزگار ما، تاریخ ادب فارسی معاصر*، جلد سوم، چاپ دوم، تهران، انتشارات زوار، **١٣٧٩/٢٠٠٠**.
* آژند، ی، *ادبیات نوین ترکیه*، تهران، انتشارات امیر کبیر، **١٣٦٤/١٩٨٥**.
* أخوان ثالث، م، *بدعتها و بدایع نیما یوشیج*، تهران، انتشارات توکا، **١٣٥٧/١٩٧٨**.
* پورچافی، ح، *جریانهای شعری معاصر فارسی، از کودتای ١٣٣٢ تا انقلاب ١٣٥٧*، تهران، مؤسسه انتشارات امیر کبیر، **١٣٨٤/٢٠٠٥**.
* جنتی عطایی، ا، *نیما، زندگی و اشعار او*، تهران، بنگاه مطبوعاتي صفی علی شاه، **١٩٥٥**.
* حسنی، ح، *موسیقی شعر نیما، تحقیقی در اوزان و قالبهای شعری نیما یوشیج*، تهران، انتشارات کتاب زمان، **١٣٧١/١٩٩٢**.
* حقوقی، م، *مروری بر تاریخ ادب و ادبیات امروز ایران ٢ (شعر)*، چاپ چهارم، تهران، نشر قطره، **١٣٨٠/ ٢٠٠١**.
* خانلری، پ، *وزن شعر فارسی*، انتشارات بنیاد فرهنگ ایران، **١٣٤٥/١٩٩٦**.
* سبزواری، م، *بدایع الأفکار في صنایع الأشعار*، تهران، نشر مرکز، **١٣٦٩/١٩٩٠**.
* شفیعی کدکنی، م، *موسیقی شعر*، تهران، مؤسسه انتشارات آگاه، **١٣٧٦**.
* شمیسا، س:

- *آشنایی با عروض و قافیه*، چاپ هفدهم، تهران، انتشارات فردوسی، ۲۰۰۱/۱۳۸۰؛
- *سبکشناسی شعر*، چاپ چهارم، انتشارات فردوس، ۱۹۹۹/۱۳۷۸.

* طاهباز، س:
- *زندگی و هنر نیما یوشیج پر درد کوهستان*، تهران، انتشارات زریاب، ۱۹۹٦/۱۳۷۵؛
- *کماندار بزرگ کوهساران، زندگی و شعر نیما یوشیج*، تهران، نشر ثالث، ۲۰۰۱/۱۳۸۰.

* طبیب زاده، ا، *تحلیل وزن شعر عامیانه فارسی*، تهران، انتشارات نیلوفر، ۲۰۰۳/۱۳۸۲.
* فلکی، م، *نگاهی به شعر نیما*، تهران، انتشارات مروارید، ۱۹۹٤/۱۳۷۳.
* کامیار، ت، *بررسی منشا وزن شعر فارسی*، مشهد، انتشارات آستان قدس رضوی، ۱۹۹۱/۱۳۷۰.
* ماهیار، ع، *عروض فارسی، شیوه‌ای نو برای آموزش عروض و قافیه*، چاپ پنجم، تهران، نشر قطره، ۲۰۰۰/۱۳۷۹.
* مرکز انتشارات کمیسیون ملی یونسکو در ایران، *یادنامه نیما، مجموعه مقالات کنگره بزرگداشت یکصدمین سالگرد تولد نیما یوشیج*، جلد اول، تهران، انتشارات کمیسیون ملی یونسکو در ایران، ۱۹۹۹/۱۳۷۸ .
* محمدی، ح، *شعر نو نیمایی، سیری در قالبهای نوین شعر فارسی*، تهران، نشر چشمه، ۲۰۰۲/۱۳۸۱.
* یا حقی، م، *چون سبوی تشنه، ادبیات معاصر فارسی*، چاپ چهارم، تهران، انتشارات جامی، ۱۹۹۷/۱۳۷٦.
* یوشیج، ن:
- *ارزش احساسات و پنج مقاله در شعر و نمایش*، Saarbrücken، انتشارات نوید، ۱۹۸۹/۱۳٦۸؛
- *مجموعه کامل اشعار فارسی و طبری*، گردآوری و تنظیم سیروس طاهباز، چاپ پنجم، تهران، انتشارات نگاه، ۲۰۰۱/۱۳۸۰؛

- *نامه های نیما یوشیج*، گردآوری و تدوین طاهباز، س، تهران، نشر آبی، **١٣٦٤/١٩٨٥**؛
- *درباره شعر و شاعری*، گردآوری، نسخه برداری و تدوین سیروس طاهباز،؟، انتشارات دفترهای زمانه، **١٣٦٨/١٩٨٩**؛
- *نامه‌های نیما*، نسخه بردار: شراگیم یوشیج، تهران، **مؤسسه** انتشارات نگاه، **١٣٧٦/١٩٩٧**.

## عەرەبی

* خەزنەدار، م، موجز *تاریخ الادب الکردي المعاصر*، ت. شیخۆ، ع، حلب، **١٩٩٣**.
* شانوف، ح، *شعر الشاعر الکردي المعاصر عبدالله گوران*، ترجمة مصطفي، ش، بغداد، المثقف الجدید، ١٩٧٥.
* معروف، ك، *الحرکة التجدیدیة في الشعر الکردي الحدیث ١٩١٤-١٩٦٥* ، القسم الاول، استکهلم، ١٩٩٢.

## فەڕەنسی

* BAUDELAIRE, C., *Les Fleurs du mal*, Paris, Gallimard, 1996.
* CLAVIER, C, *Rôle psychologique et social des poésies turque, kurde et persane du XXe siècle*, vol.1 Thèse de doctorat, Sorbonne Nouvelle, 2001, 263p., non publié.
* DUPRIEZ, Bernard, *Gradus, Les procédés littéraires (dictionnaire)*, Paris, 10/18, 1984.
* FISER, E., *Le Symbole littéraire*, Paris, Rien De Commun, s.d.
* LESCOT, R., *Nîma Youchîdj,* Melange Massé, 1963.
* MACHALASKI, F. :
- *La Littérature de l'Iran contemporain*, vol. I, Kraków, Drukania Uniwersytetu, 1965, vol. 1, pp 7-20.
- *La Littérature de l'Iran contemporain*, vol. II, Karaków, Drukania uniwersytetu, 1967.

## ئینگلیزی

* MORRISON, G., *History of Persian Literature from the Beginning of the Islamic Period to the Present Day*, Leiden, E.J., 1981, pp. 150-159
* THIESEN, F., *A Manuel of Classical Persian Prosody*, Wiesbaden, Otto Harrassowitz, 1982.

variable structure, which was to reflect the multiple semantic nuances in the poem.

In a similar perspective, Goran sought to free Kurdish poetry from its classical constraints. But he soon turned to non-academic forms of poetry to meet his ends, and made use of a prosody widely inspired by oral Kurdish poetry, which had hardly ever been written at all. In so doing, he granted the poetic pattern a claim to immemorial Kurdish origins. In his critical essays on poetry writing, Nimâ suggests that the poet must coin a new personal poetic language and imagery. But Goran mostly aims to be universally understood. He calls for a “kurdified” lexicon and straightforward imagery. His formal poetic innovations therefore reveal an ideological concern with identity which is entirely absent from Nimâ’s work.

In ridding itself of Persian influence, one may wonder, could modern Kurdish poetry therefore have sought to meet with the issues of rising national awareness? The comparative study of the two founding figures of Kurdish and Persian poetic modernity breathes new life into this contemporary political debate.

# Abstract

From its earlier stages, the developments of Kurdish poetry had mostly followed in the wake of the widely approved of Persian model. But when both languages took a step forward into literary modernity in the first decades of the 20th century, Kurdish poetry somewhat freed itself from the Persian tradition.

This newly achieved autonomy appears particularly clear if one considers the scant interest with which Abdollah Goran, master figure of the Kurdish poetic modernity, greeted the achievements of his Iranian counterpart, Nimâ Yushij, despite his perfect knowledge of both classical and contemporary Persian poetry. A comparison of the two poets' work, of their use of prosody, formal devices and linguistic structures, as well as of their respective imagery, may explain the reasons for this divorce.

In their account of poetic modernity itself, and the main reforms it implies, the poets widely differed in view. According to Nimâ, Persian classical poetry, petrified as it were, could now hardly escape academism. As a solution, he called for radical technical changes and conceived of a thoroughly new aesthetic. He claimed to shatter the traditional uniformity of meter and monotony of rhyme to give rise to a

toutes les nuances de sens du poème.

Parti d'un projet similaire, Goran interroge davantage les formes de poésies non conventionnelles, et trouve bientôt une solution dans l'emploi d'une prosodie inspirée de la poésie orale. Le renouvellement des techniques poétiques qu'il envisage ainsi vise principalement la réappropriation par le poète d'une identité kurde longtemps ignorée par l'écrit. Aussi, si Nimâ encourage le poète à créer un langage nouveau et à façonner des images riches en polysémie, le travail de Goran témoigne à l'inverse de la volonté de se rendre accessible au plus grand nombre. « Kurdification » du lexique et transparence de l'imagerie sont les deux mots d'ordre de son esthétique.

Les innovations formelles de la poésie de Goran témoignent ainsi d'un souci idéologique et identitaire absent de la démarche de Nimâ. La poésie kurde moderne aurait-elle conquis son indépendance vis-à-vis du modèle persan sur la base d'une conscience nationale assumée ? L'étude conjointe des deux principaux initiateurs de la modernité poétique kurde et persane soulève du moins la question.

# Résumé

La poésie kurde s'est longtemps développée dans le sillage de la tradition persane. Mais le début du XXe siècle qui marque l'avènement de la modernité littéraire dans les deux langues voit la poésie kurde s'émanciper de l'hégémonie persane. Cette prise de distance se manifeste notamment dans l'indifférence qu'Abdollah Goran, figure emblématique de la modernité poétique kurde, semble témoigner à l'égard de son homologue iranien, Nimâ Yushij, en dépit de sa connaissance notoire de la poésie persane classique et contemporaine.

Une analyse comparée des procédés formels de ces deux poètes, de leur usage respectif de la prosodie et des structures linguistiques, comme de leur imagerie privilégiée, nous éclaire sur les causes de ce divorce. Il résulte de la divergence de vue que revendiquent les deux poètes dans leur conception même de la modernité poétique et des réformes qu'elle implique.

Nimâ s'engage dans une refonte esthétique et technique intégrale de la poésie persane classique, parvenue selon lui à un stade de figement proche de l'académisme. Pour y remédier, il rompt avec l'homogénéité du mètre et la monotonie d'une rime autrefois invariable, introduisant une liberté relative dans la structure, qui doit désormais refléter

# سوپاسی

لێرەدا بە پێویستی دەزانم ئەو پەڕی ڕێز و سوپاسم ئاراستەی ماموٚستای بەڕێزم پروٚفیسوٚر یان ریشار Yann Richard بکەم کە بە دڵگەرمییەوە لە ماوەی ئامادەکردنی نامەکەمدا، لە ڕێنماییە بەنرخەکانی سوودمەندی کردم. هەروەها پڕ بەدڵ سوپاسی بەڕێز و خوٚشەویست خاتوٚ ژوستین لاندوٚ Justine Landau دەکەم کە بە درێژایی ئامادەکردنی نامەکەم، شانبەشان یارمەتیدەرم بوو و منی بەو پەڕی دڵسوٚزییەوە بە ڕێنمایی و زانیارییە زانستییەکانی خوٚی دەوڵەمەند کرد. سوپاس و پێزانینی خوٚم پێشکەشی بەڕێزان پروٚفیسوٚر پییێر لوٚکوٚک Pierre Lecoq و د.کریستین ئالیسوٚن Christine Allison دەکەم بوٚ بەشداربوونیان لە لێژنەی دانوستاندنی نامەکەمدا.